# ڕێزمانی کوردی سۆرانی

نووسەر:
دوکتور عەلی روخزادی

سنە

سنه ـ پاساژی عیززەتی ـ تەلەفوون ـ ۲۲۶۵۳۸۲

---

# ڕێزمانی کوردی سۆرانی



| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕێزمانی کوردی سۆرانی |
| ✓ نووسەر (مؤلف): | دکتر علی رخزادی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ۱۳۸۹ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۲۰۰۰ (بەرگ) جلد |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۱۴۴ صفحەی رقعی |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

---

نرخی:
۲۰۰۰ تمەنە

شابک: ۲ ـ ۹۸ ـ ۷۶۳۸ ـ ۹۶۴ ـ ۹۷۸
ISBN: 978 - 964 - 7638 - 98 - 2

پێشکەشە بە:
-زمان و فەرهەنگی رەسەن و مێژینەی کوردەواری
-ئەوانەی بۆ ئەم زمان و فەرهەنگە دڵیان لێئەدا و بە چالاکی و دڵسۆزی گەشەی پێ ئەدەن.

# پێرست

## تێبینی

ئەم کتێبە یەکێکی ترە لە بەرهەمە بەنرخەکانی «دکتور عەلی ڕوخزادی» کە پێشکەشی خوێنەرانی بەڕێز ئەکرێ.

ئەم مامۆستا زانا و پایەبەرزە چەند ساڵ دوای نووسینی کتێبی پڕناوەرۆک و ئاکادێمیکی «آواشناسی و دستور زبان کردی» کە لە بواری زمانەوانی کوردیدا بێوێنەیە، ئەم کتێبەشیان بە ناوی «ڕێزمانی کوردی سۆرانی» کە ڕێزمانێکی ئاکادێمیکە، لە سەر ئەو بنەما زانستی‌یانە وا خۆیان ڕەچاویان کردبوو، لە ئاستی زانکۆ و زانستگەدا نووسی و لە هاوینی ساڵی ۱۳۸۵ هەتاوی بە تەواوی ئامادەی چاپی کردبوو. بەڵام ماوەی ژیانی پڕبایەخیان دەرفەتی ئەوەی نەدا کە لە ژێر چاودێری خۆیان لە چاپی بدەن.

وێڕای ڕێز بۆ گیانی پیرۆزی مامۆستا «دوکتور عەلی ڕوخزادی» و ئەو هەوڵانە بۆ گەشەی فەرهەنگ و زمان و وێژەی کوردی داویەتی، ئێستا عەینی دەقی کتێبە کە پێشکەش ئەکرێ. هیوادارین ئۆگرانی زمانی کوردی کەڵکی پێویستی لێ وەربگرن.

ئەمیر ئەمجەد ڕوخزادی

سنە ـ خاکەلێوەی ۱۳۸۹ هەتاوی

## سەرەتا

زمانی کوردی ئەمڕۆ، بە بڕوای زانایان و ڕۆژ هەڵاتناسان و بە گوێرەی جۆغرافیای مێژووی کوردستان و بە هۆی تایبەتمەندییەکانی زمانناسی یەوە، درێژەی ئاڵ و گۆڕ بەسەردا هاتووی بنەماڵەی زمانی ئارییایی و لە شاخەی زمانی مادی یە.

لەم زمانە ئەمڕۆ چوار لقی سەرەکی رووەوە و هەریەک لە ناوچەهایەکی کوردستاندا چالاکن، یەکێ لەو لقە بەهێزانە کوردی سۆرانی یەکە بە هۆی ناوچەی جۆغرافیایی بەربلاۆیەوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، وەک زمانی یەکگرتووی کوردی ناسراوەو بووە بە زمانی نووسین و ئاخاوتن و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و دەورێکی گرینگ و چالاکی لە ئەمڕۆدا پەیداکردوە و ڕۆژ بە ڕۆژیش لە حاڵی پەرەسەندن و بەهێزبوون دایە.

ئەم کتێبە، ڕێزمانی کوردی سۆرانی یە و بە شێوازی زمانناسی و زانستی نووسراوەو لە چۆنیەتی ئەم زمانە باس ئەکا و ڕێزمانێکی تەوسیفی ـ ساختاری یە.

نووسەر هیواداره لەم کتێبەدا توانی بێتی پاراوی و بەهێزی زمانی کوردی لە روانگەی زانستی یەوە تا ڕادەیەک ناساندبێتی و کەڵکی لێ وەربگیردرێ.

ئەم ڕێزمانە ئەگەرچی تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەڵام دەشتوانین وەرگێڕاوی بەشێک لە کتێبی «آواشناسی و دستور زبان کُردی» کە چەند ساڵ لەمەو پێش لە لایەنی ئەم نووسەرەوە ئاراستە و چاپ کراو بڵاوە بوو، ناوی بنێین. لەو ڕووەوە ئەگەر خوێنەری وردبین لە شوێنهایەکی ئەم کتێبەدا، نیازی بە لێکۆڵینەوە و تێبینییەکی زۆرتر بوو، سەرنجی ڕادەکێشین بۆلای «آواشناسی و دستور زبان کُردی».

ناوەرۆکی ئەم ڕێزمانە پێک هاتووە لەم بەشانە:

- بەشی یەکەم: دەنگ
- بەشی دووەم: شێوازی نووسینی زمانی کوردی (خەتی کوردی سۆرانی)
- بەشی سێیەم: ڕێزمانی کوردی سۆرانی
- بەشی چوارەم: نموونەهایەک لە پەخشانی زمانی کوردی ئەمڕۆ.

**علی رُخزادی**

## پێشه‌کی

شاخه‌کانی زمانی کوردی ئه‌مڕۆ و ناوچه‌ جوغرافیاییه‌کانیان

## الف ـ کرمانجی باکوور

**زاراوه‌کانی ئه‌م شاخه:** جزیره‌یی، هه‌کاری، بایزیدی، بۆتانی، شه‌مدینانی، بادینانی.

## ناوچه‌ی جۆغرافیایی:

**١ـ له‌ تورکیه‌دا:** جزیره، دیاربه‌کر، ئه‌رزڕۆم، بایزید، هه‌کاری، ماردین، بتلیس، وان، ئاگری، شه‌مدینان و...

**٢ـ له‌ عێراق‌دا:** عه‌قره، دهۆك، زاخۆ، عه‌مارییه، سه‌نجار و...

**٣ـ له‌ ئێران‌دا:** ئورمییه، سه‌لماس، ماکۆ، نه‌غه‌ده، برادۆست، ته‌رگه‌وه‌ر، مه‌رگه‌وه‌ر، کورده‌کانی خوراسان.

**٤ـ له‌ سورییه‌دا:** قامیشلی، حه‌سه‌که و...

**٥ـ کورده‌کانی ئه‌رمه‌نستان:** ئازه‌ربایجان، گورجستان، تورکمه‌نستان و...

## ب ـ کرمانجی باشوور (سۆرانی بە گشتی)

**زاراوەکانی ئەم شاخە:** موکریانی، سۆرانی (تایبەت)، سنەیی (ئەردەڵانی)، جافی.

## ناوچەی جۆغرافیایی:

**١ـموکریانی:** مەهاباد، بۆکان، سەردەشت، پیرانشار، نەغەدە، ئوشنۆ.

**٢ـسۆرانی (تایبەت):**

**٢ ـ ١ لە عێراقدا:** سلێمانی، کەرکووک، هەولێر، مووسڵ، ڕەواندز، چەمچەماڵ، شەقلاوە، کۆیە، قەڵادزە...

**٢ ـ ٢ لە ئێراندا:** سەقز، بانە، مەریوان، تیکاب.

**٣ـسنەیی (ئەردەڵانی):** سنە، کامیاران، دیواندەرە، لەیلاخ.

**٤ـجافی**

**٤ ـ ١ لە عێراقدا:** شارەزوور، کەرکووک، کفری، کەلار و...

**٤ ـ ٢ لە ئێراندا:** جوانڕۆ، ڕەوانسەر، سەرپێڵزەهاو، سەلاس باوەجانی.

## ج ـ کرماشانی ـ لوڕی

**زاراوەکانی ئەم شاخە:** کرماشانی، لوڕی، فەیلی، لەکی، بەختیاری.

## ناوچەی جۆغرافیایی:

### ١ـکرماشانی

**١ ـ ١ لە ئێراندا:** کرماشان، دالاهوو، سەحنە، کەنگاوەر، قەسر شیرین، هەرسین، سونقور، کولیایی، ئیسلامئاوا، قورووە، بیجار، ئیلام، ئەیوان، ئابدانان، مێهران، دێلوڕان.

**١ ـ ٢ لە عێراقدا:** خانەقین، مەنەلی، بەدرە و...

### ٢ـلوڕی، لەکی، فەیلی، بەختیاری.

لوڕستان، پشتکۆ، پێشکۆ، بەشێ لە ئیلام و...

## د ـگۆرانی ـزازایی

**زاراوەکانی ئەم شاخە:** گۆرانی (هەورامی)، زازایی.

### ١ـگۆرانی (هەورامی):

**١ ـ ١ لە ئێراندا: هەورامان تەخت:** باشووری مەریوان، ژاوەرۆ.

**هەورامان لهۆن:** پاوە، نەوسوو، نۆدشە.

**١ ـ ٢ لە عێراقدا:** هەڵەبجە، بیارە، تەوێڵە، زەنگنە و کاکەیی لە کەرکووک...

### ٢ـزازایی

**لە تورکیەدا:** بینگۆڵ، دیرسیم، خارپووت، مەعدەن، ئەرزەنجان، دیاربەکر، ئورفا، بتلیس.

**تێ بینی** ـ لەو ناوچانەی وا بۆ هەر شاخەیەکی زمانی کوردی ناومان لێ بردوە، کەم تا زۆر وێژەرانی شاخەکانی تری زمانی کوردیش‌یان تێدایە و دیاری‌کردنی هەرناوچەیەک بۆ شاخەیەکی زمانی کوردی لێرەدا بە پێی زۆرینەی وێژەرانی ئەوشاخەوە، دیاری کراوە.

* * *

## زمان و بەرهەمەکانی

زمان ← لقی‌سەرەکی ← سەرلق ← لقۆڵکە

زمان ← شاخە ← زاراوە ← بن‌زاراوە

زبان ← شاخە ← گونە ← لهجە

وەک: کُردی ← سۆرانی ← سنەیی ← لەیلاخی

مانند: پهلوی ← فارسی ← تهرانی ← احمدآبادی

## ١ـ دەنگ چییە؟

دەنگ بەشێکی بچووکی زمانە کە لە زەنجیرەی وتاردا چەندێکیان تێکەڵ دەبن و بەشێکی گەورەتر بەناوی «بڕگە» یا «هیجا»[1] یا «سیلاب»[2] دروست دەکەن. وەک وشەی «هاوین» کە دروست بووە لە پێنج دەنگی: ه، ا، و، ی، ن.

وە لە تێکەڵبوونی ئەو دەنگانە، دوو بڕگە یا هیجای: ها + وین پێکهاتووە.

بڕگەی هەوەڵ دوو دەنگە: هـ + ا.

بڕگەی دووەم سێ دەنگە: و + ی + ن.

لە هەر بڕگەیەکدا، بەگوێرەی سورووشتی زمان، تەنیا یەک پیتی دەنگداری بەرز یا نزم هەیە. بۆ نموونە لەو دوو بڕگەدا دەنگداری «ا» / «ی» ئەبینرێ. «ا» لە بڕگەی یەکەمدا و «ی» لە بڕگەی دووەمدا.

## ٢ـ دەنگەکان لە زمانی کوردیدا

لە زمانی کوردیدا وەکوو هەموو زمانەکانی عالەم، دەنگ زۆرە و مرۆڤ دەتوانێ دەنگێکی بێژمارە و بێسنوور دروست بکا، بەڵام هەموو

1- Phone. 2- Syllable.

ئەو دەنگانەکە دروستی دەکا، لە ژیانی مرۆڤدا بەهرەیان لێ وەرناگیرێ و بەکەڵک نایەن، لە ئەنجامدا دەنگە بێ کەڵکەکان ئەکەونە پەراوێزی زمانەوە و هەر دەنگە بەکەڵکەکان دێنە ئاراوەو بایەخیان پێ ئەدرێ. باسی ئێمەیش لەم وتارەدا لەسەر دەنگە چالاک و بەکەڵکەکانی زمانە.

## ۳ـ ئەنواعی دەنگەکانی زمانی کوردی

دەنگەکان لە زمانی کوردیدا بە «پیت» دەناسرێن و دوو بەش:

الف ـ پیتی دەنگدار (= مصوّت، vowel).

ب ـ پیتی بێدەنگ (= صامت، Consonant).

**الف ـ پیتە دەنگدارەکان، دوو دەستەن:**

ـ پێنج پیتی دەنگداری بەرز: ی، وو، ا، ێ، ۆ.

ī، ū، ā، ē، ō

ـ سێ پیتی دەنگداری نزم:

ه (= ـَـ) ، و (= ـُـ) ، $\phi$ (= ـِـ)

a ، o ، e

تێبینی: عەلامەتی $\phi$ بە واتای نەبوونی نیشانەی ڕێنووسە بۆ پیتی دەنگداری نزمی (ـِـ)

ب ـ پیتە بێ دەنگەکان «۲۹» ژمارەن:

ء (= ?)، ب (= b)، پ (= p)، ت (= t)، ج (= J)،

چ (= č)، ح (= ḥ)، خ (= x)، د (= d)، ر (= r)،

ڕ (= r̄)، ز (= z)، ژ (= ž)، س (= s)، ش (= š)،
ع (= ؟)، غ (= γ)، ف (= f)، ڤ (= v)، ق ( = q)،
ک (= k)، گ (= g)، ل (= l)، ڵ (= ľ)، م (= m)،
ن (= n)، و (= w)، ه (= h)، ی (= y).

**تێبینی ١**-له ڕێنووسی کوردی سۆرانیدا، بۆ دەنگداری نزمی (ـــِ) نیشانەیەک دانەنراوە، بەڵام له فۆنیتیکی لاتینیدا بەنیشانەی (e) دەناسرێ وەک: دڵ ←deľ / زک zek / مەنزڵ manzeľ.

**تێبینی ٢**-دوو پیتی (و ـ ی)ی بێدەنگ لەگەڵ دەنگدارەکاندا ئەم جیاوازییەیان هەیە:

له بڕگه یا هیجادا هەوەڵین یا سێیەمین پیتن.

وەک: ورچ werč / یار yār / خەو xaw / بەین bayn

بەڵام: ئەگەر (و ـ ی) دووەمین پیتی بڕگه بێ، دەنگدارە.

وەک: شوو šu / سی si / موو mu / پی pi / تۆ tō / بێ bē / کورد kord

ـ له بەعزە وشەهایەکدا دوو پیتی (و ـ ی) دووەمین پیتن و بێدەنگیشن، لێرەدا ئەو دوو پیتە نە بێدەنگی تەواون و نە دەنگداری تەواو، و بەو بۆنەوە پێیان ئەوترێ «نیوەبزوێن» چونکە هەم نیوە دەنگێکیان هەیە و هەم له جێگەی دەنگداریشدا دانیشتوون.

وەک: خوا xwa / گیان gyān

## ۴ـ جێگەی پیتەکان لە وشەدا بە گشتی

### الف ـ پیتە بێدەنگەکان

لەو ۲۹ ژمارە پیتی بێدەنگەکە ناومان برد، غەیری ئەم چەن پیتە «ء ـ ر (نەرم) ـ ڵ (سەخت) ـ ی» باقییان لە هەوەڵ و ناوەڕاست و ئاخری وشەدا، بەکار ئەبرێن. بەلاّم ئەوچەن پیتە:

ـ پیتی «ء» لە زمانی کوردیدا تەنها لە هەوەڵی وشە یا بڕگەدا، دێت و هەمزەی ناوەراست و ئاخری وشە یا بڕگە، کوردی نییە.

ـ پیتی «ر = نەرم»، لە هەوەڵی وشە یا بڕگەی کوردیدا نایەت.

ـ پیتی «ڵ = سەخت» لە هەوەڵی وشە یا بڕگەی کوردیدا نایەت.

ـ پیتی «ی»ی بێدەنگ لە ئاخری وشە یا بڕگەی کوردیدا نایەت.

### ب ـ پیتە دەنگدارەکان

ـ پیتی دەنگداری بەرز و نزم بە تەواوی لە هەوەڵی وشە و بڕگەدا نایەن.

ـ دوو پیتی دەنگداری نزمی «و = ـُـ / $\phi$ = ـِـ» لە ئاخری وشە و بڕگەدا نایەن.

## ۵ـ پیتی سەربەخۆ (واتە: مستقلّ) کامە؟

«پیت» کە موعادلی زانستی ئەبێتە: phoneme (فونم)، هەر ئەو دەنگانەن کە لە زماندا هەن و مەعنایان هەیە و لە زمانی کوردیدا بریتین لە ئەو ۲۹ بێدەنگ و ۸ دەنگدارە کە پێشتر ناسیمان.

بەپیتی مەعنادار، «واج»یش ئەوترێ.

پیت یا واج، کاتێ سەر بەخۆیە، کە ئەگەر لە وشەیەکدا، جێگەی لەگەڵ پیتێکی تردا ئاڵ و گۆڕ بکرێ، مەعنای ئەو وشە بگۆڕدرێ. وەک: «پ» لە وشەی «پووش puš» داکە ئەگەر لای بەین و «ت» یا «ڕ» لە جێگەکەیدا دابنێین مەعنای وشەکە بە تەواوی ئەگوڕدرێ.

پووش ← تووش ← ڕووش.

دیارە هەرکام لەو سێ وشە بەهۆی گۆڕانی پیتی هەوەڵەوە، سێ مەعنای جیاوازیان هەیە.

لە زمانی کوردیدا ئەو ٢٩ پیتە بێدەنگ و ٨ دەنگدارە، بینا بەو قاعیدە، هەموو سەر بەخۆن.

نموونە:

-گۆڕانی پیتی بێدەنگ لە هەوەڵی وشەوە:

باڵ، پاڵ، کاڵ، چاڵ، ماڵ، خاڵ، ساڵ، تاڵ...

-گۆڕانی پیتی دەنگداری ناوەڕاستی وشە:

کاڵ، کۆڵ، کێڵ، کەڵ، کوڵ، کِڵ

-گۆڕانی پیتی بێدەنگی ئاخری وشە:

تام، تاو، تان، تار، تاس، تاش، تاک....

هەروەها کە باسمان کرد، ئەوەی کە ئەبێتە هۆی گۆڕانی مەعنای وشەکان، جێ‌نشینی و گۆڕانی پیتە سەربەخۆکانە.

## ٦ـ جیاوازی پیتە هاو ڕواڵەتەکانی زمانی کوردی

چەند پیتی بێدەنگ و دەنگدار لە زمانی کوردیدا هەن کە بە ڕواڵەت شێوازی یەکن بەڵام هەرکام سەربەخۆن و بەجێ بەجێ کردنیان لە وشەکاندا، جیاوازی و سەربەخۆیی‌یان دەسەلمێ.

ئەو پیتانە ئەمانەن:

أ ـ «ر ـ ڕ» ← fortis - lenis (واتە: ر نەرم ـ ڕسەخت)

- «ر» نەرم ← بەرە (سێنگ بەندی ئەسپ)
- «ڕ» سەخت ← بەڕە (گلێم)
- «ر» نەرم ← قۆرە (هەنگووری نەگەیشتوو)
- «ڕ» سەخت ← قۆڕە (دەنگی گا)
- «ر» نەرم ← بار (بار)
- «ڕ» سەخت ← باڕ (جوجەڵەی بەهارە)

ب ـ «ل ـ ڵ» ← fortis - lenis (واتە: ل نەرم ـ ڵ سەخت)

- «ل» نەرم ← پەلە (عەجەلە)
- «ڵ» سەخت ← پەڵە (وەشتی بارانی پایز)
- «ل» نەرم ← گول (دەردەداری گولی)
- «ڵ» سەخت ← گوڵ (گوڵ)
- «ل» نەرم ← شِل (نەرم)
- «ڵ» سەخت ← شِڵ (پۆستی سوور و سپی)

ج ـ «ۆ ـ وو»ی دەنگداری بەرز

- «ۆ» ← بۆ (بۆوبەرامە)
- «وو» ← بوو (کەڕەبوو)
- «ۆ» ← تۆ (جێناو)
- «وو» ← توو (دار توو ـ بەرهەمی دار توو)
- «ۆ» ← رۆن (رۆن)
- «وو» ← روون (رۆشن، رووناک)

د ـ «ی، ێ» ی دەنگداری بەرز

- «ی» ← شیر (شیری خواردن)
- «ێ» ← شێر (شێری جەنگەڵ)
- «ی» ← پی (چەوری پی)
- «ێ» ← پێ (پا)

ه ـ «و» ی دەنگداری نزم ـ «و»ی بێدەنگ

جیگایان لە وشەدا ناتوانێ بەرابەر بێ و موقابەلە بکرێ.

- «و» دەنگدار ← کوڵ
- «و» بێدەنگ ← کەو
- «ی»ی بێدەنگ

لەگەڵ دەنگدارەکاندا موقابەلە ناکرێ و جیاوازە.

- «ی» ← یار، بەین.

* * *

## ڕاهێنان (= تمرین)

١ـ ئـەم وشـانە هـەرکام چـەن بـڕگەن و هـەر بـڕگە لەچـەن دەنگ پێکهاتووە؟

ئاسیاو ـ ئێوارە ـ بەیانی ـ پاراو ـ پارێز ـ تانجی ـ تەماکـۆ ـ تـووتن ـ جیاواز ـ جێناو ـ چەوسانەوە ـ چەمچەماڵ ـ خاکەلێوە ـ خورماڵ ـ خەوتن ـ دەماوەن ـ رازیانە ـ رەشەڕیحان ـ زەماوەن ـ زاوا ـ سەوزی ـ سامانسا ـ سەیران ـ شێرکۆ ـ شارباژێڕ.

نموونە:

مەلەوان ← مَە + لە + وان (٣ بڕگە)

مە (٢ دەنگ) + لە (٢ دەنگ) + وان (٣ دەنگ)

٢ـ بۆ پیتە دەنگدارەکانی زمانی کوردی، هەریەک دوو نموونە وشە بنووسن.

٣ـ فۆنیتیکی ئەو وشانە وا لە ڕاهێنانی (ا)دا هاتووە، بنووسن و بزانـن ژمارەی دەنگەکان لە ڕێنووسی کوردی و فۆنیتیکدا بەرابەرە؟

وەک: داخِستِن ← dāxesten

ـ ئەوەمان لە بەرچاو بێ کە بۆ دەنگداری نزمی (ــِـ) لە ڕێـنووسی کوردیدا نیشانەیەکمان نییە و خۆمان دەتوانین بـە عـەلامەتی کـەسرە نیشانی بدەین.

وەک: لابردن ← لابِردِن ← lāberden

۴- پیتی هەوەڵی ئەم وشانە، هەریەک بە چوار پیتی‌تر بگۆڕن و وشەی مەعناداریان لێ دروست بکەن.

دەم - چاو - سەر - هەور - تاوە

۵- پیتی ناوەراستی ئەم وشانە بەو چەشنەی سەرەوە بگۆڕن.

شۆر - پار - خۆڵ - بەن - سوور

٦- پیتی ئاخری ئەم وشانە بەو چەشنە بگۆڕن.

دەم - دار - شێر - شەش - مار

* * *

## ـ ڕێنووس

«ڕێنووس» یا «خەت» وەکوو پێویستییەکی گرینگ، بۆ نیشاندانی دەنگەکانی زمان دروست بووە، بەڵام بێ‌گومان تا ئێستا لە هیچ زمانێکی عالەمدا «ڕێنووس»ی تەواو و بێ‌عەیب، بەو چەشنەی کە بتوانێ هەموو تایبەتمەندی و هێز و توانایییەکانی یەک زمان نیشان بدا، دروست نەبووە. یەعنی ڕێنووس نەیتوانیوە و ناتوانێ چۆنیەتی زاتی و سورووشتی یەک زمان بە تەواوی، بە غەیری ئەهلی ئەو زمانە فێر بکا. ئەم کەم و کۆڕییە لە هەموو ڕێنووسەکانی عالەمدا هەیە و ڕێنووسی زمانی کوردیش لەو عەیبانە، تەریک نییە.

جا هەر بەو هۆیەوە، ئەهلی زمانەکان هاتوون و بێژگە لە پیتەکان، نیشانەهایەکیان لەسەرو خواری بەعزە پیتێ زیادکردووە و بۆ فولان دەنگی زمان قەراریان داوە بەو هیوایەکە ناتەواوی و عەیبی پیتەکان بۆ نیشاندانی دەنگەکانی زمان، قەرەبوو بکەنەوە، ئیتر چەندە هەوڵەکەیان بە نەتیجەگەیشتبێ، خۆیان دەزانن! لە ئەنجامدا دێینە سەر ئەو باوەڕەکە ڕێنووس تا ئەمڕۆ لە هەموو زمانەکاندا وەکوو نیشاندەری دەنگەکانی زمان، هێشتا ناتەواوە و ئەم هەوڵانەش بگرە هەر درێژەی بێ.

## شێوازی نووسین لە زمانی کوردیدا

لە زمانی کوردی ئەمڕۆدا دوو شێوازی نووسین بەکار دەبرێ:

- کوردی باکوور و زازاکی بە شێوازی ئاڵفابێتای لاتین،
- کوردی سۆرانی و هەورامی و کرماشانی و لوڕی بە شێوازی ئەلف و بێی عەرەبی، دەنووسرێ.

## لە رێنووسی کوردی سۆرانیدا ئەم تایبەتمەندییانە هەیە:

١ـ دەنگی نزمی (ــَـ) واتە فتحە بە «ە، ـە» ئەنووسرێ و بە فۆنیتیکی «a» نیشان ئەدرێ.

| | |
|---|---|
| حَسَن ← حەسەن | ḥasan |
| عَجَلە ← عەجەلە | ʕaJala |
| دَست ← دەست | dast |

٢ـ دەنگی نزمی (ــُـ) واتە ضَمّە بە «و» ئەنووسرێ و بە فۆنیتیکی «o» نیشان ئەدرێ.

| | |
|---|---|
| کُرد ← کورد | kord |
| گُڵ ← گوڵ | goľ |
| شُکر ← شوکر | šokr |

٣ـ بۆ دەنگی نزمی (ــِـ) واتە کسرە لە رێنووسی سۆرانیدا نیشانەیەک دانەنراوە، بەڵام لە فۆنیتیکدا بە (e) ئەنووسرێ.

| | |
|---|---|
| دڵ ← | deľ |
| گرتن ← | gerten |
| خواردن ← | xwārden |

**تێبینی** ـنووسەری ئەم کتێبە وەکوو پێشنیار لەسەر ئەو باوەڕەیەکە بۆ ئەم دەنگە لە هەمان نیشانەی کەسرە (ـــِـ) کەڵک وەرگیرێ، چونکە نەبوونی نیشانەی دەنگی نزمی (ـــِـ) لە خەتی کوردی‌دا، وەکوو ناتەواوی‌یەک بۆ فێرکردنی ڕێنووسی کوردی بە غەیری کورد زمان، ئاشکرایە.

۴ـ دەنگی بەرزی «ی»ی کراوەکە بۆ دروستبوونی دەم نیوەکراوەیە و لێو ئەکێشرێ و لە بەرەوەی دەمەوە دەنگ ئەداتەوە، بە شێوازی «ێ» ئەنووسرێ و بە فۆنیتیکی «ē» نیشان ئەدرێ.

شێر ← šēr

ڕێبوار ← rēbwār

پێ ← pē

**تایبەتمەندی ئەم دەنگە:** دەم نیوەکراوە، لێو کێشراو، دەنگ پێش دەم.

**تێبینی:** ئەم دەنگە بەرزە لە زمانی پەهلەویدا چالاک بووە و گەیشتووەتە فارسی دەری، بەڵام لە فارسی ئەمڕۆدا نی‌یە و پێی‌ئەوترێ: «ی مجهول».

۵ـ دەنگی بەرزی «و»ی کراوەکە بۆ دروستبوونی دەم نیوەکراوەیە و لێو گرد ئەبێتەوەو لە ئاخری دەمەوە دەنگی دێ، بە شێوازی «ۆ»، ئەنووسرێ و بە فۆنیتیکی «ō» نیشان ئەدرێ.

بۆ ← bō

شۆن ← šōn

کۆمار ← kōmār

**تایبەتمەندی ئەم دەنگە:** دەم نیوە کراوە، لێو گردی کراوە، دەنگ پاش دەم.

**تێبینی:** ئەم دەنگە بەرزە لە زمانی پەهلەوی و فارسی دەریدا چالاک بووە، بەلاّم لە فارسی ئەمڕۆدا نی‌یەو پێی ئەوترێ: «و مجهول».

٦ـ دەنگی بەرزی «و»ی گووشراو، کە لە پێکهاتنی‌دا، لێو گردو کێشراو ئەبێتەوە و دەم ئەگووشرێ و دەنگەکەی لە ئاخری دەمەوە سەر هەڵئەدا، بە شێوازی «وو» ئەنووسرێ و بە فۆنێتیکی «u» نیشان ئەدرێ.

| | |
|---|---|
| توو ← | tu |
| خەسوو ← | xasu |
| سووتان ← | sutān |

**تایبەتمەندی ئەم دەنگە:** دەم گووشراو، لێو گرد و کێشراو، دەنگ پاش دەم.

**تێبینی:** ئەم دەنگە بەرزە لە پەهلەوی و فارسی دەری و فارسی ئەمڕۆدا بووەو هەیە و بە «ی معلوم» دەناسرێ.

٧ـ لە زمانی کوردی‌دا دوو پیتی «ر» هەیە، «ر»ی نەرم، «ڕ»ی سەخت. کە بە نیشانەی (ˇ) لە ژێرەوی پیتەکەدا، سەخت لە نەرم جودا ئەبێتەوە و هەریەک بەم فۆنێتیکە نیشان ئەدرێن:

| | | |
|---|---|---|
| «ر» نەرم ← | r | lenis |
| «ڕ» سەخت ← | r̄ | fortis |

ـ لە هەوەڵی وشەی کوردی‌دا فەقەت «ڕ»ی سەخت دێت.

ـ «ڕ»ی سەخت لە هەوەڵ و ناوەڕاست و ئاخری وشەدا دێت.

- «ر»ی نەرم لە ناوەڕاست و ئاخری وشەدا دێت.

وەک:

«ڕ»ی سەخت: ڕۆن / دڕیاگ / شەڕ

«ر»ی نەرم: ـــــ / نەرم / سەر

**تێبینی ١:** چونکە «ر»ی هەوەڵی وشە لە کوردیدا، فەقەت «ڕ»ی سەختە، ئیتر پێویست ناکا بۆ «ر»ی هەوەڵ نیشانە دابنێین.

**تێبینی ٢:** ئەم دوو پیتە هەریەک تایبەتمەندی خۆیان هەیە و بۆ ناسینیان سەرنجی خوێنەری بەڕێز رادەکێشین بۆ کتێبی «آواشناسی و دستور زبان کُردی».

٨- دوو پیتی «ل»ی نەرم و «ڵ»ی سەخت لە زمانی کوردیدا هەیە کە بە نیشانەی (˅) لە سەرەوی پیتە سەختەکەدا، لەیەک جودا ئەبنەوە و بەم فۆنیتیکە نیشان ئەدرێن:

«ل» نەرم ← l lenis

«ڵ» سەخت ← ľ fortis

- لە هەوەڵی وشەی کوردیدا، فەقەت «ل»ی نەرم دێت.

- «ل»ی نەرم ل هەر جێگایەکی وشەدا دێت.

- «ڵ»ی سەخت، لە ناوەڕاست و ئاخری وشەدا دێت.

وەک:

«ل»ی نەرم: لاواز / تاولەمە / کەل

«ڵ»ی سەخت: ـــ / قالاو / سۆڵ

تێبینی: ئەم دوو پیتە هەریەکێ تایبەنمەندی خۆیان هەیە. (بڕوا بۆ هەمان سەرچاوەی رابوردوو).

٩- پیتی گیرەدار (واتە: مشدّد) لە رێنووسی کوردیدا بە دوو پیت دەنووسرێ

مکّه ← مەککە

خُرّم ← خوررەم

کَلّه ← کەللە

تێبینی: زمانی کوردی لەگەڵ تەشدیدا سازگار نییە و ئەو وشانەش وا لەکوردیدا بە تەشدیدەوە هەن، لە زمانی فارسی یا عەرەبییەوە هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە و زۆربەیان لەکوردیدا تەشدیدەکەیان ناخوێنرێتەوە.

وەک:

اوّل ← هەوەڵ

منّت ← منەت

البتّه ← ئەڵبەت

غلّه ← خەلە

١٠- هەمزە «ء» بەم شێوازانە لەگەڵ پیتە دەنگ دارەکاندا کۆ ئەبێتەوە و ئەنووسرێ:

ء + ا = ئا : ئاو ، ئاگر

ء + ە = ئە : ئەگەر ، ئەسپ

ء + و = ئو : ئوستا ، ئومێد

ء + ۆ = ئۆ : ئۆخەی ، ئۆگر

ء + ی = ئی : ئیش ، ئیسکان

ء + ێ = ئێ : ئێش ، ئێواره

١١ـ تەنوینی عەرەبی، ئەبێ بە «ن»

حتماً ← حەتمەن

یقیناً ← یەقینەن

ثانیاً ← سانیەن

١٢ـ ئەلفی مەقسوورەی عەرەبی، ئەبێ بە «الف»

مصطفیٰ ← موستەفا

عیسیٰ ← عیسا

موسیٰ ← مووسا

١٣ـ ئەم پیتانە لە ڕێنووسی کوردی‌دا نین (ث، ذ، ص، ض، ط، ظ) بۆ نیشان‌دانی ئەوانە لە پیتەکانی (س، ز، ت) کەڵک وەردەگیرێ.

ـ پیتی «ط» بە «ت» دەنووسرێ.

خط ← خەت

طناب ← تەناب

ـ دوو پیتی «ث، ص» بە «س» دەنووسرێ

ثروت ← سەروەت

صبر ← سەبر

تکثیر ← تەکسیر

مصیبت ← موسیبەت

سێ پیتی «ذ، ض، ظ» بە «ز» دەنووسرێ

بذل ← بەزل

ضربە ← زەربە

ظاهر ← زاهر

١۴ـ جەدوەلی پیتەها و رواڵەتەکانی رێنووسی کوردی

| پیتەکان | فۆنیتیک | نەوع | لەوشەدا |
|---|---|---|---|
| و | o | دەنگدارى نزم | کورد، گوڵ |
| و | w | نیوە دەنگدار | ورد، گەورە |
| ۆ | ō | دەنگدارى بەرز | چۆڵ، بۆ |
| وو | u | دەنگدارى بەرز | سوور، توو |
| ی | i | دەنگدارى بەرز | تیر، پی |
| ێ | ē | دەنگدارى بەرز | شێر، شێ |
| ی | y | نیوە دەنگدار | یار، بەین |
| ر | r | بێدەنگی نەرم | بەرد، تیر |
| ڕ | r̄ | بێدەنگی سەخت | ڕۆژ، گەڕ |
| ل | l | بێدەنگی نەرم | لار، مەلە |
| ڵ | ľ | بێدەنگی سەخت | گوڵاڵە، کەڵ |

## پاشکۆ

١ـ نموونەهایەک لە پەخشان و شیێعری فارسی گولستانی سەعدی «گلستان سعدی» لەگەڵ وەرگێڕاوی بەرێنووسی کوردی، بۆ موقابەلە و ڕێکەوتن.

«منّت خُدای را، عَزَّ وَ جَلَّ، که طاعتش مُوجبِ قُربَتَست و به شکُر اندرش مَزید نِعْمت.»

ڕێنووسی کوردی:

مننەت خودای را، عەززە وەجەللە، ک تاعەتەش مووجب قوربەتەست و ب شوکر ئەندەرەش مەزید نعمەت.

*

«هَرْ نَفَسی که فرو می‌رود مُمِدِّ حیاتَست و چون برمی‌آید مُفَرِّح ذات.»

ڕێنووسی کوردی:

هەر نەفەسی ک فوروو می‌ڕەوەد مومدد حەیاتەست و چون بەر می‌ئایەد موفەررح زات.

*

«پس در هَر نَفَسی دو نعمت مَوجودَست و بَرْ هَرْ نعمتی شکری واجب.»

**رێنووسی کوردی:**

پەس دەر هەر نەفەسی دو نعمەت مەوجوودەست و بەر هەر نعمەتی شوکری واجب.

*

«از دست و زبان که بَرآیـد　　　کز عُهدهٔ شکرش بدر آید»

**رێنووسی کوردی:**

ئەز دەست و زەبـان ک بـەرئایەد　　　کەز عوهدەیٚ شوکرەش بدەرئایەد

*

«بنده همان به که زتقصیر خویش　　　عُــذر بــه درگـاه خـدای آوَرَد
ورنــــه ســزاوار خــداوَنــدیش　　　کس نتواند کـه بـه جـای آوَرَد»

**رێنووسی کوردی:**

بەندِ هەمان بە ک زتەقسیر خویش　　　عوزر ب دەرگاه خودای ئاوەرەد
وەرنــە سزاوار خـوداوەنـدییەش　　　کەس نەتەوانەد ک ب جای ئاوەرەد

*

٢ـ چەند قسەی بەنرخ لەسەر رێنووسی کوردی سۆرانی.

ـ ئەگەر بەیانی زمانەکەم بفەوتێ، با من ئەمڕۆ بمرم.

(داغستانی من)

ـزمان شاڕەگی ژیانی مرۆڤە، کە زمانیان فەوتانی، واتە شاڕەگی ژیانیان بڕیوی.

ـ زمان هـەویە و نـاسنامەی گـەلە، ئـەم نـاسنامە ئـەبێ بـەدڵ و گـیان بپارێزرێ.

ـ ئەوانەی وا زمانەکەیان بێبایەخ دەکەن، نۆکەری بێجیرەو بەراتی

دوژمنانی گەلەکەیان.

- کوردی زمانە و زمانێکی سەربەخۆیە و لەهجە و زاراوەی زمانەکانی هاوچەرخی خۆی نییە.

- ئەوانەی وا زمانی کوردی بە «نیوەزمان» یا «لەهجە» ناو دەبەن یا بەم زمانە شارەزا نین، یا مەبەستیان شکاندنی هەویەی ئەم زمانەیە کە لە هەر دوو حاڵەتدا، قسەکانیان بێبایەخە.

* * *

## ڕاهێنان (= تمرین)

١ـ ئەم وشە عەرەبی و فارسی‌یانە، بە ڕێنووسی کوردی بنووسنەوە.

اضطراب ـ آشفتگی ـ بصارت ـ سبزپوش ـ تَضَرّع ـ ثابت‌قدم ـ متغیّر ـ پلنگ‌افکن ـ اعتذار ـ دمدمه ـ فروردین ـ اُتاق ـ ایمان ـ ذرّه ـ متکلّم ـ توت‌فرنگی ـ جلادت ـ اندرز ـ زحمت‌دادن ـ اصفهان ـ مسلّماً.

٢ـ ئەم دوو بەیتە بکەن بە ڕێنووسی کوردی.

اَلا یا اَیُّها السّاقی اَدِر کأساً وَ ناوِلها

که عشق آسان نمود اوّل ولی افتاد مشکلها

*

مژده‌ای دل که دگر باد صبا باز آمد

هُدهُد خوش خبر از طرف سبا باز آمد

٣ـ بۆ هەرکام لەم پیتانە پێنج وشەی کوردی بنووسن:

ڵ ـ ل ـ ڕ ـ ر ـ ۆ ـ ێ ـ وو

## ئەوەی لەم بەشەدا هاتووە:

- وەسفی قاعیدە سوروشتی و زاتیەکانی زمانی کوردی ئەمڕۆیە.

- دوور لەو قاعیدانە باسمان نەکردووە و حوکمی نارەوامان نەداوە، چونکە لەسەر ئەو باوەڕەین کە زمان رەوتی سوروشتی خۆی ئەپێوێ و ناچێتە ژێر فەرمانی هیچ حوکمێکی غەیری سوروشتی یەوە.

- ئەم بەشە پێکهاتووە لە ١٠ فەسڵ، هەشت فەسڵی لەسەر ئەنواعی وشەکان و چۆنایەتیان باس ئەکا (واتە: صرف)، دوو فەسڵی ئاخریشی تەرخان دراوە بە رستە و ئەنواع و ئەرکانیانەوە (واتە: نحو).

* *

### ئەنواعی وشە لە زمانی کوردی‌دا

وشەکان لە زمانی کوردی‌دا بریتین لە:

ناو ـ ئاوەڵناو ـ جێناو ـ کردار ـ ئاوەڵکار ـ شێوەڕستە ـ ئامراز.

# فەسڵی یەکەم: ناو (= اسم)

ناو، وشەیەکە دانراوە بۆ ناسینی هەر نەوعەگیان‌دار و بێ گیانێ وەك: شێرکۆ، فەرهاد، شیرین، کەو، ئاسك، گوڵ، دار، کێو، هۆش.

## ئەنواعی ناوەکان

### ١ـناوی گشتی (= اسم عام):

ئەو ناوەیەکە بۆ زیادتر لە یەك کەس دانراوە و میسداقی لە دەرەوە، زۆرە.

وەك: باخ، مرۆڤ، پیاو، ژن، بەرد، کێو، چەم، دەفتەر.

**تێبینی:** ناوی تایبەتی ئینسانەکان ئەگەرچی بۆ زیادتر لە یەك کەس بەکار دەبرێن، بەلاّم ناوی گشتی نین.

*

### ٢ـناوی تایبەت (= اسم خاص):

ئەو ناوەیەکە بۆ یەك کەس دانراوە. چ بۆ ئینسان چ غەیری ئینسان.

وەك: فەرهاد، شیرین، زاگرۆس، هەولێر، سیروان.

*

## ٣ـناوی ساده (= اسم بسیط):

ناوێکی یەک وشەیی و مەعناداره.

وەک: شەو، ڕۆژ، ژن، پیاو، دار، بەرد.

## ٤ـناوی ناساده (= اسم غیربسیط):

ئەم ناوە چەند شێوازی هەیە و گرنگترینیان ئەمانەن:

٤ ـ ١ پێشگر + ناوێکی سادەی مەعنادار وەک: ڕاگەیاندن

٤ ـ ٢ ناوێکی سادەی مەعنادار + پاشگر وەک: ئەنگوسیلە

٤ ـ ٣ دوو ناوی سادەی مەعنادار وەک:گوڵخانە

٤ ـ ٤ دوو ناوی سادەی مەعنادار + ناوگری «و» وەک: هات و چوو

٤ ـ ٥ ژمارە + ناوی سادە وەک: چوارباخ

و...

*

## ٥ـناوی ناسراو (= اسم معرفه):

بە ناوێ ئەوترێ کە بۆ بیسەر ناسراو بێ. ئەم ناوە لە زمانی کوردیدا سێ نیشانەی هەیە کە دوو نیشانەیان ئەکەونە ئاخری ناوەکەوە و نیشانەیەکیشیان لە هەوەڵی ناودا دێت.

«کە = ka-»، «ەکە = aka-» لە ئاخری ناودا:

چرا + کە = چراکە (واتە ئەوچرا وا دەیناسین)

ماڵ + ەکە = ماڵەکە (واتە ئەو ماڵە وا دەیناسین)

ـ نیشانەی «کە» ئەکەوێتە دوای ناوێکەوەکە بە پیتی دەنگداری «ا» یا «ـە» تەواو بووبێ: برا + کە = براکە / خەلە + کە = خەلەکە.

ـ نیشانەی «ەکە» ئەکەوێتە دوای هەر ناوێکیترەوەکە بە پیتی بێدەنگ یا دەنگدار، غەیری «ا، ـە» تەواو بووبێ.

کتێب + ەکە = کتێبەکە

پێنووس + ەکە = پێنووسەکە

□ ئەگەر ناوەکە بە پیتی دەنگداری «ێ» یا «ی» تەواو بووبێ، پێش نیشانەی ناسراوی «ەکە» پیتی نیوە دەنگداری «ی = y» وەکوو ناوجێ، ئیزافە ئەکرێ.

دێ + ی (ناوجێ) + ەکە = دێیەکە

dē + y + aka = dēyaka

ماسی + ی (ناوجێ) + ەکە = ماسییەکە

māsi + y + aka = māsiyaka

□ ئەگەر ناوەکە بە پیتی دەنگداری «وو» یا «ۆ» تەواو بووبێ، پێش نیشانەی «ەکە» پیتی نیوەدەنگداری «و = w» وەکوو ناوجێ، ئیزافە ئەکرێ.

توو + و (ناوجێ) + ەکە = توووەکە

tu + w + aka = tuwaka

گوڵۆ + و (ناوجێ) + ەکە = گوڵۆوەکە

goľō + w + aka = goľōwaka

ـ نیشانە سێیەمی ناوی ناسراوکە ئەکەوێتە هەوەڵی ناوەکەوە، نیشانەی ئیشارەی «ئەم» یا «ئەو»ە.

بەهاتنی ئەم نیشانەیە، دەنگدار نزمی «ە» دێتە ئاخری ناوەکەوە.

ئەم + پیاو + ە = ئەم پیاوە

ئەو + ژن + ە = ئەو ژنە

## ٦ـ ناوی نەناسراو (= اسم نکرە):

بەناوێ ئەوترێ کە بۆ بیسەر ناسراو نەبێ. ئەم ناوە لەزمانی کوردیدا دوو نیشانەی هەیە کە ئەکەونە ئاخری ناوەکەوە.

ـ «ێ = ē-»: ماڵ + ێ = ماڵێ

ـ «ێک = ēk-»: پیاو + ێک = پیاوێک

ـ نیشانەی «ێ = ē-» بێ ئاڵ و گۆڕ ئەکەوێتە ئاخری هەموو ناوەکانەوە، چ بە پیتی دەنگدار یا بێدەنگ تەواو بووبێتن.

کتێب + ێ = کتێبێ

کابرا + ێ = کابرای

توو + ێ = تووێ

هەڵۆ + ێ = هەڵۆێ

شەمامە + ێ = شەمامەێ

ـ نیشانەی «ێک = ēk-» چەند تایبەتمەندی هەیە:

: بێ ئاڵ و گۆڕ ئەکەوێتە دوای هەر ناوێکەوە وا بە پیتی بێدەنگ تەواو بووبێ.

زەلام + ێک = زەلامێک

دارستان + ێک = دارستانێک

دەست + ێک = دەستێک

: ئەگەر ناوەکە بە یەکێ لە پیتە دەنگدارەکانی «ا، ۆ، ێ، ی، ە» تەواو بووبێ، دوو حاڵەت پێش دێ:

الف ـ نیشانەی نەناسراوی «ێک = ēk-» بێ ئاڵ و گۆڕ دەچەسپێتە ئاخری ناوەکەوە:

چرا + ێک = چرایێک čerā + ēk = čerāek

هەڵۆ + ێک = هەڵۆێک

دێ + ێک = دێێک

ماسی + ێک = ماسیێک

خەلە + ێک = خەلەێک

ب ـ پێش چەسپانی نیشانەکە، «ی»ی ناوجێ ئەچەسپێ بە ئاخری ناوەکەوە. دوای ئەوە نیشانەکە لە «ێک» ئەگۆڕێ بە «ەک» و لە ئاخرەوە جێگیر ئەبێ.

چرا + ی (ناوجێ) + ەک = چرایەک čerā+y+ak= čerāyak

هەڵۆ + ی (ناوجێ) + ەک = هەڵۆیەک

دێ + ی (ناوجێ) + ەک = دێیەک

ماسی + ی (ناوجێ) + ەک = ماسییەک

خەلە + ی (ناوجێ) + ەک = خەلەیەک

: ئەگەر ناوەکە بە پیتی دەنگداری «وو» تەواو بووبێ، پێش نیشانەی

نەناسراو، «و»ی ناوجێ ئیزافە ئەبێ.

کوانوو+و(ناوجێ)+ێک=کوانووویێک kwānu+w+ēk= kwānuwēk

*

## ٧ـ ناوی تاک (= اسم مفرد):

ناوێکە کە ڕواڵەتدا نیشانەی کۆی نییەو لە مەعناشدا دەلالەت لەسەر یەک کەس دەکا.

وەک: خانوو، منداڵ، مەکتەب، کێو، کتێب.

*

## ٨ـ ناوی کۆ (= جمع):

ناوێکە نیشانەی کۆی هەیە و دەلالەت لەسەر زیادتر لە یەک کەس دەکا.

وەک: منداڵان، خانووەکان، کوڕگەل.

نیشانەی کۆی چالاک لە زمانی کوردیدا بریتییە لە: «ان». لە دەورێکی کەمتریشدا «گەل».

وەک: کچان، کوڕان، کچگەل، کوڕگەل.

لە کوردیدا دوو نیشانەیتری کۆ بەکار دەبرێ کە وەکوو دوو نیشانەی رابوردوو چالاک نین: «ها»، «ات».

وەک: قسەها، مالات.

ژمارە ئەسڵییەکانیش لە پێش ناودا، مەعنای کۆ بەوناوە ئەدەن.

وەک: شەش دەفتەر، چوارکەس، هەشت خانوو.

تێبینی: نیشانەی کۆی «گەل» تایبەتە بە زاراوەی «سنەیی» واتە ئەردەڵانی، بەڵام ئەمڕۆ وەکوو نیشانەیەکی چالاک لەزمانی کوردی‌یەک گرتوودا، دەوری هەیە.

## ناوی ناسراوی کۆ (= اسم معرفۀ جمع):

ناوی ناسراو لە زمانی کوردی‌دا، نیشانەی کۆی «ان» دەگرێ و لەگەڵ هیچ نیشانەیەکی تری کۆدا سازگار نی‌یە.

وەک: کوڕەکان،ماڵەکان، دارەکان، حیکایەتەکان

هەروا کە دەی‌بینین، نیشانەی کۆ ئەکەوێتە دوای نیشانەی ناوی ناسراو.

تێبینی: کاتێ کە نیشانەی کۆ ئەکەوێتە دوای نیشانەی ناوی‌ناسراو، دەنگی نزمی (ە) لە ئاخری نیشانەی ناسراوەکە، لائەچێ. واتە «ەکە» ئەبێ بە «ەک»:

ماڵ + ەکە + ان = ماڵەکان

دەفتەر + ەکە + ان = دەفتەرەکان

*

## ٩ـ ناوی کۆی بێ‌نیشانە، یا ناوی کۆمەڵ (= اسم جمع):

ناوێکی کۆی بێ‌نیشانەیە واتە لە ڕواڵەتدا تاکە، چونکە نیشانەی کۆی لەسەر نی‌یە بەڵام لە مەعنادا کۆیە.

وەک: هۆز، گەل، نەتەوە، میللەت، قەوم، قەبیلە، خێڵ، قافڵە.

ناوی کۆی بێنیشانه دەتوانێ نیشانەی کۆ بگرێ: میللەتان، قەومان، خێڵ گەل.

**تێبینی:** هەر ناوێ هەموو نیشانەکانی کۆ ناگرێ، بەڵکوو ناوەکان بە هۆی ڕواڵەت و چۆنیەتی زاتی خۆیانەوە نیشانەی کۆی تایبەت بە خۆیان دەگرن.

*

## ١٠ـناوی سەربەخۆ (= اسم ذات):

بەناوێ ئەوترێ کە بێیارمەتی ناوێکی‌تر بۆ بیسەر بناسرێ و هەستی پێ بکرێ و بشێ ببینرێ.

وەکێ: مرۆڤ، ئەرز، ئاسمان، کێو، گوڵ، خاک، دار.

**تێبینی:** ناوی خودا، جێگە (= مکان)، عوامیلە سوروشتیەکان، سەربەخۆن.

وەکێ: الله، ئێرە، ئەوێ، هەوا، ئوکسیژن، هیدرۆژن.

*

## ١١ـناوی ناسەربەخۆ یا سەربە غەیر (= اسم معنی):

بەناوێ ئەوترێ کە بە یارمەتی ناوێکی‌تر دروست ببێ و بناسرێ و سەربەخۆ نە بینرێ.

وەکێ: هۆش، عەقڵ، زانین، هاتن، تاریکی، ڕووناکی.

**تێبینی:** ناوی زەمان (= اسم زمان)، چاوگە (= مصدر)، ناوی چاوگ

(= اسم مصدر)، بەرهەمی چاوگ (= حاصل مصدر) ناسەر بەخۆن.

وەک: ئەمڕۆ، خواردن، کۆشش، ئازایەتی.

## ١٢ـناوی هاوکێش (= إتباع):

بەناوێ ئەوترێ کە بەدوای ناویا ئاوەڵ ناوێکی بناغەیی‌دا بێ، بۆ دروست‌کردنی هاوکێشی ئەو بناغەیە و ئەغڵەب بێ‌مەعنایە. لە بەینی ئەو دوو ناوەشدا ئامرازی پێوەندی «و» بەکار دەبرێ.

وەک: دیوار و میوار، قاڵی و ماڵی، خاک و ماک، ڕەش و مەش، گرد و مرد.

نیشانەی ئەو هاوکێشە زۆرتر ئەمەیە کە بە پیتی «م» دەس پێ ئەکا.

*

## ١٣ـناوی دەنگ (= اسم صوت):

ئەم ناوە، دەنگی سوروشتی ئینسان و حەیوان و هەر نەوعە گیان‌دار و بێ گیانە.

وەک: بۆڵە، بۆڕە، جریکە، خشە، تەقە...

زمانی کوردی وەک زمانێکی پاراو، بۆ هەر نەوعە دەنگێکی سوروشتی، وشەی تایبەتی خۆی هەیە، بەو چەشنە کە هەر کوردزمانێ بە بیستنی ئەو وشەیە، هەست بە سەرچاوەی دەنگەکە ئەکا.

بۆ نموونە:

بۆڕە : دەنگی گاوگوێر

بۆڵە : دەنگی نارەزایەتی مرۆڤ

شریخە : دەنگی هەورە تریشقە

پرژە : دەنگی داڕشتنی ئاو یا باران

جریوە : دەنگی جوجەڵە

ئەم ناوانە بەشێوازی لێکدراویش (واتە: مرکّب) بەکار دەبرێ:

جریوە جریو، تەپە تەپ، خرنگە خرنگ، ناڵە ناڵ...

*

## ١٤ـ ناوی گچکە (= اسم مصغّر):

ناوێکە دەلالەت ئەکا لە چتی بچووک چ بۆ ئینسان چ بۆ غەیری ئینسان. نیشانەی ناوی گچکە لەزمانی کوردیدا زۆرە، ئەو نیشانانە لەئاخری ناو یا ئاوەڵ ناودا دەچەسپن و ئەمانەن:

١ـ انە : نەشمیل + انە = نەشمیلانە

٢ـ چە : باخ + چە = باخچە

٣ـ ەک : تیر + ەک = تیرەک

٤ـ ـِک :داس + ـِک = داسِک

٥ـ ۆک :گرد + ۆک = گردۆک

٦ـ ۆکە : منداڵ + ۆکە = منداڵۆکە

٧ـ ۆڵ : خرت + ۆڵ = خرتۆڵ

| | | |
|---|---|---|
| ٨ـ ۆڵك | : تەپ + ۆڵك | = تەپۆڵك |
| ٩ـ ۆڵکە | :گرد + ۆڵکە | = گردۆڵکە |
| ١٠ـ ۆڵە | : مەشک + ۆڵە | = مەشکۆڵە |
| ١١ـ ەڵە | :گرد + ەڵە | = گردەڵە |
| ١٢ـ ەڵووکە | : بەفر + ەڵووکە | = بەفرەڵووکە |
| ١٣ـ یەکۆڵە | : شووتی + یەکۆڵە | = شووتییەکۆڵە |
| ١٤ـ یلانە | : خڕ + یلانە | = خڕیلانە |
| ١٥ـ یلکە | : سێو + یلکە | = سێویلکە |
| ١٦ـ یلە | : خڕ + یلە | = خڕیلە |
| ١٧ـ وولکە | : داس + وولکە | = داسوولکە |
| ١٨ـ وولە | : مێش + وولە | = مێشوولە |
| ١٩ـ لە | :گرێ + لە | = گرێلە |
| ٢٠ـ ەڵ | : بووچك + ەڵ | = بووچکەڵ |

*

## ١٥ـ چاوگ (= مصدر):

چاوگ، کار یا کردارێ نیشانئەدا کە «کات» و «کەس»ی تێدا نەبێ. واتە ئەگەر «کات» و «کەس» لە «کردار» لابەین، دەبێ بە چاوگ. بەوهۆیەوە، چاوگ، ناوە و ئەبێ لە فەسڵی ناودا باسی لێ بکرێ.

نیشانەکانی چاوگ لە زمانی کوردیدا:

١ـتِن ٢ـدِن ٣ـین ۴ـان ۵ـوون

نموونە:

١ـتِن : کەوتن، کوشتن، وتن، نووستن، رشتن

٢ـدِن: بردن، سپاردن، ناردن، خواردن، کردن

٣ـین: درِین، کرِین، ماڵین، دوورین، فرِین

۴ـان: سووتان، دان، مان، لێنان، وەستان

۵ـوون: چوون، بوون، دروون، بەربوون

*

## ١٦ـناوی چاوگ (= اسم مصدر):

ناوی چاوگ و ئاکامی چاوگ وشەهایەکی تاک یا تێکەڵن، کە مەعنای چاوگ ئەدەن، بەڵام نیشانەی چاوگیان نییە.

وەک: وتە (= وتن)، هات و چوو (= هاتن و چوون).

هەڵسە و دانیشە (= هەڵسان و دانیشتن)، چاکی (= چاک بوون).

بەرزی (= بەرز بوون).

ئەم ناوانە لە زمانی کوردیدا زۆرن و بۆ نموونە چەندێکیان لە رووی دروستبوونەوە نیشان ئەدەین:

کوشش (لە چاوگی کۆشین)

زانست (لە چاوگی زانین)

| | |
|---|---|
| وتار | (لە چاوگی وتن) |
| چاکە | (لە ئاوەڵناوی چاک + ە) |
| برایەتی | (لە ئاوەڵناوی برا + یەتی) |
| دۆستایەتی | (لە ئاوەڵناوی دۆست + ایەتی) |
| دایک و فەرزەنی | (لە دوو ئاوەڵ ناو + ناوگری «و» + ی) |
| خەنەبەنان | (لە ناو + چاوگی بەستن) |
| هاورد و برد | (لە دوو چاوگی هاوردن، بردن + «و»ی ناوگر) |
| وت و وێژ | (لە چاوگی وتن بە دوو بەرهەمەوە + «و»ی ناوگر) |
| مڵ و مۆ | (لە دوو ناو + «و»ی ناوگر) |
| گیرو گرفت | (لە چاوگی گرتن بە دووبەرهەمەوە + «و»ی ناوگر) |
| خوردو خۆراک | (لە چاوگی خواردن + و + ناو) |

*

## ڕاهێنان (= تمرین)

١ـ ئەم ناوانە بکەن بە «ناوی ناسراو»

ڕەنگ ـ پەردە ـ کچ ـ کوڕ ـ هاوسەر ـ کەوان ـ هەور ـ با ـ پا ـ تان‌وپۆ ـ هەڵۆ ـ تانجی.

٢ـ ئەو ناوانە بکەن بە «ناوی نەناسراو»

٣ـ ئەم ناوانە بکەن بە «ناوی کۆ» (بێ ئەوەی نیشانەی ناوی ناسراوی پێ بدەن)

کورد ـ پیاو ـ ژن ـ شەمامە ـ قسە ـ دەستە ـ گوڵۆ ـ گوڵۆڵە ـ ئاو ـ دێ.

٤ـ ئەو ناوانە کردووتانە بە ناوی ناسراو بیکەن بە ناوی کۆ

٥ـ دە ناوی نادە بنووسن و بەشەکانیان لەیەک جودا بکەنەوە.

* * *

# فەسڵی دووەم: ئاوەڵناو (= صفت)

ئاوەڵناو وشەیەکە بۆ ڕاگەیاندنی یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی ناو؛ ئاوەڵناو زۆرتر لەگەڵ ناودا دێت، چ پێش و چ پاش ناو؛ ئەگەر ئاوەڵ ناو، لەگەڵ ناودا نەیەت، حیسابی ناو یا جێناوی لەسەر ئەکرێ.

## جێگای ئاوەڵ ناو:

الف ـ ئاوەڵ ناوەکانی پێش ناو

ب ـ ئاوەڵ ناوەکانی پاش ناو

## الف ـ ئاوەڵ ناوەکانی پێش ناو:

١ـ ئاوەڵ ناوی ئیشارە (= اشارە) وەک: ئەو پیاوە ـ ئەم کتێبە

٢ـ ئاوەڵ ناوی پرسیار (= پرسشی) وەک: کام خانوو؟ ـ چ پێ نووسێ؟

٣ـ ئاوەڵ ناوی نادیار (= مبهم) وەک: هیچ کەس ـ هەر مرۆڤێ

٤ـ ئاوەڵ ناوی ژمارە (= شمارشی) وەک: سێ نەفەر ـ پەنجا کەس

٥ـ ئاوەڵ ناوی سەرترین (= عالی) وەک: چاکترین مەکتەب ـ باشترین ڕێکەوت

٦ـ ئاوەڵ ناوی سەرسووڕێنەر (= تعجّبی) وەک: عەجەب کاری! ـ چۆن کوڕێ!

٧ـ لەقەب (= شاخص) وەک: میرزا ئەحمەد ـ شێخ سەعید

*

**ب ـ ئاوەڵ ناوەکانی پاش ناو:**

١ـ ئاوەڵ ناوی سادە (= سادە)　　وەک: مرۆڤی ئازا ـ کوڕی زیرەک

٢ـ ئاوەڵ ناوی کارایی (= فاعلی)　وەک: پیاوی زانا ـ کاکەی کرێکار

٣ـ ئاوەڵ ناوی بەرکاری (= مفعولی)　وەک: مافی فەوتاو ـ شێری کوژراو

٤ـ ئاوەڵ ناوی نیسبەت (= نسبی)　وەک: دۆستی سەردەشتی ـ هەڤالی دێرین

٥ـ ئاوەڵ ناوی لیاقەت (= لیاقت)　وەک: قسەی پیاوانە

٦ـ ئاوەڵ ناوی ژمارەی ڕوتبی (= ترتیبی) وەک: پۆلی سێیەم ـ گروپی چوارەم

٧ـ ئاوەڵ ناوی پرسیار (= پرسشی) وەک: پۆلی چەندەم؟ ـ گروپی چەند؟

*

## ناسینی ئاوەڵ ناوەکان بەگشتی

### الف ـ ئاوەڵ ناوەکانی پێش ناو:

### ١ـ ئاوەڵ ناوی ئیشارە

بۆ ئاماژەکردنی ناوێکی نزیک یا دورە.

ئەم ئاوەڵ ناوە دوو لەفزی هەیە:

«ئەم» بۆ نزیک / «ئەو» بۆ دوور

ئەم ماڵە زۆر خۆشە / ئەو ئاوێنە تەمیز نییە.

### ٢ـ ئاوەڵ ناوی پرسیار

لە چۆنیەتی یا ئەندازەی ناوی دوای خۆی پرسیار ئەکا.

لەفزەکانی ئەمانەن:

کام؟، کامە؟، چ؟، چلۆن؟، چەن؟، چەند؟، چۆن؟
بۆ کام شەقام دەچن؟ / چەن قوتابی هاتن؟

*

## ٣ـئاوەڵ ناوی نادیار

چۆنیەتی ناوی دوای خۆی بەگوێرەیەکی نادیار بەیان ئەکا.
لەفزەکان ئەمانەن:
هەر، هەموو، هیچ، فلان، زۆر، بەعزێ، نەختێ، چکێ، بڕێ، کەمێ، نەختاڵێ، تۆزکاڵێ، هەندێ.
هەندێ کەل و پەلمان سەند. / هەموو دۆستان رووبان تێ کردین.

*

## ٤ـئاوەڵ ناوی ژمارە

ژمارەی ناوی دوای خۆی یا تەرتیبی ئەو ناوە یا کەسرێ لەو ناوە بەیان ئەکا.
ژمارەکان ئەمانەن:
ـژمارەی سەرەکی واتە ئەسلی: یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش، حەوت، هەشت، نۆ، دە، یازدە... بیست، سی... سەد، هەزار.
پێنج کەس هاتن / دوو لاپەڕەم خوێند.
ـژمارەی ڕوتبی واتە تەرتیبی: یەکەم، دووەم، یەکەمین، چوارەمین...
... دووەم نەفەر ئەو بوو / پێنجەمین خانوو، هی ئەوانە

ـ ژمارەی کەسری: دوویەک، پێنج یەک، لەسەدا حەفتا.
سەدی پەنجا، چوار لە دە، سەد لە هەزار،...
هەشتاد لە سەد دەنگی هێنا / سێ یەکی مەشقەکەی نووسی.
**تێبینی** ـ هەندێ جار دوای ئاوەڵناوی ژمارەی سەرەکی (= ئەسڵی) وشەها یەک بۆ ناساندنی نەوعی ناوی دوایی دێت کە لەگەڵ ئاوەڵناوە پێشووەکەدا، ئاوەڵناوێکی لێکدراو (= مورەککەب) دروست دەکەن.
وەک: دوو دەست جل و بەرگ / چوار سەر حەیوان.

*

## ٥ـ ئاوەڵناوی سەرترین

ئەندازە و چۆنیەتی ناوی دوای خۆی لەگەڵ ناوەکانی هاونەوعیدا بە هەڵسەنگاندن نیشان ئەدا و سەر ئەخا. نیشانەی ئەم ئاوەڵناوە «ترین»ەکە بەدوای ئاوەڵناوێکی ئاساییدا ئەچەسپێ: باشترین، خراپترین، توندترین، گۆیڕایەڵترین، خۆ بە زل زانترین، بالاّ بەرزترین.
ئەو لە باشترین ئینسانی ئەم ڕۆژگارەیە.
ئەحمەد بالاّبەرزترین وەرزشکاری مەیدانی بەسکتباڵە.

*

## ٦ـ ئاوەڵناوی سەر سووڕێنەر

سەر سووڕمانی وێژەر لە چۆنیەتی یا ئەندازەی ناوی دوای خۆی بەیان ئەکا. وشەکانی ئەمانەن. عەجەب! عەجەوا! چ! چۆن!

وەک: چ هەوایەکە! چۆن کوڕێ!

*

### ٧ـ لەقەب

ناو یا ئاوەڵ ناوێکە بەرلە ناوێکیتر دێت و لەقەب یا ڕوتبە یا مەقامی ئەو ناوە، بۆ ناسینی لەکۆمەڵدا بەیان ئەکا.

وەک: میرزا مەحموو، قازی عەلی، دوکتور زانیار، خاڵۆ سەعید، حاجی جەلال، دەروێش عەبدوڵڵا.

*

## ب ـ ئاوەڵ ناوەکانی پاش ناو

### ١ـ ئاوەڵ ناوی سادە

لە تایبەتمەندی ناوی بەرلە خۆی باس دەکا بێ‌ئەوەی مەعنای ئاوەڵ ناوەکانیتری پاش ناو، وەکوو کارا، بەرکار، نیسبەت، لیاقەت، بدا.

وەک: باخی سەوز، دەستی درێژ، هەوای گەرم، دەشتی بەرین.

*

### ٢ـ ئاوەڵ ناوی کارایی

ئەم ئاوەڵ ناوە مەعنای کارایی ئەبەخشێ بەناوی پێش خۆی. وەک: «زانا» واتە ئەو کەسی کە دەزانێ. نیشانەکانی ئەم ئاوەڵ ناوە، کە ئەکەونە ئاخری وشەوە، ئەمانەن:

ـ ـەر	وەک: خوێنەر، نووسەر، بینەر

ـ کەر	وەک: ناوجێ کەر، نانکەر، درەو (دروێنە) کەر

ـ گەر	وەک: ئاسنگەر، مسگەر

ـ گر	وەک: وێنەگر، پاشگر

ـ گیر	وەک: هەویرگیر، دەسگیر

ـ الف	وەک: زانا، پرسا

ـ دەر	وەک: گوێدەر، خەوەردەر

ـ کار	وەک: رۆژکار، خوێنکار

ـ یار	وەک: جووتیار، دەسیار

*

### ٣ـ ئاوەڵ ناوی بەرکاری

ئەم ئاوەڵ ناوە مەعنای بەرکاری ئەبەخشێ بەناوی پێش خۆی.

وەک: «کوژراو» واتە ئەو کەسەی کە کرداری کوشتن بەسەر ئـەودا ئەنجام دراوە.

نیشانەکانی ئەم ئاوەڵناوە، کە ئەکەونە ئاخری وشەوە، ئەمانەن:

ـ راو	وەک: کوژراو، نووسراو، داسەپێنراو

ـ او	وەک: شکاو، خِنکاو، رەنجاو، تۆراو

ـ یاگ	وەک: شکیاگ، کوژیاگ، بریاگ، دووریاگ

*

## ٤ـ ئاوەڵ ناوی نیسبەت

ئەم ئاوەڵ ناوە نیسبەتی کەسێ یا چتێ ئەدا بەلای کەسێ یا چتێکی ترەوە.

وەک: «کوردستانی» واتە ئەوکەسەی وا خەڵکی کوردستانە.

نیشانەکانی ئەم ئاوەڵ ناوە، کە ئەکەونە دوای وشەوە، ئەمانەن:

ـ ی وەک: کوردستانی، ئاسمانی، باکووری

ـ ین وەک: زێڕین، نەخشین، نەرمین

ـ ینە وەک: مسینە، پەشمینە، زەڕینە

ـ ە وەک: بەهارە، پایزە، نیوە

ـ انە وەک: ڕۆژانە، شەوانە، نێرانە

ـ چی وەک: قافڵەچی، چایچی، تفەنگچی

ـ نۆک وەک: ترسنۆک، گرینۆک

ـ ۆک وەک: گِلۆک، لەرزۆک

ـ وو وەک: پووشوو، ژووروو

ـ یلە وەک: کێویلە، عەرزیلە

*

## ٥ـ ئاوەڵ ناوی لیاقەت

ئەم ئاوەڵ ناوە، شیاوی و قابلبوونی ناوی پێش خۆی نیشان ئەدا.

وەک: «سووتەمەنی» واتە ئەو چتەی کە شیاوی سووتانە.

نیشانەکانی ئەم ئاوەڵ ناوە، کە ئەکەونە دوای وشەوە، ئەمانەن:

ـانە وەک: پیاوانە، شاهانە

ـەمەنی وەک: خواردەمەنی، سووتەمەنی

*

## ٦ـئاوەڵ ناوی ژمارەی ڕوتبی

ئەم ئاوەڵ ناوە ڕوتبەی ناوی پێش خۆی بەیان ئەکا.

سەفی یەکەم، گروپی چوارەمین

*

## ٧ـئاوەڵ ناوی پرسیار

ئەم ئاوەڵ ناوە لە چۆنیەتی ناوی پێش خۆی پرسیار ئەکا.

پۆلی چەندەم؟، دەستەی چەند؟

*

## ئاوەڵ ناو لە ڕوانگەی ڕواڵەتەوە

### ١ـئاوەڵ ناوی سادە

یەک وشەی مەعنادارە: ئازا، زیرەک، سەوز، سارد، گەرم.

### ٢ـئاوەڵ ناوی ناسادە

چەند شێوازی هەیە و گرنگترینیان ئەمانەن:

ـ پێشگر + ئاوەڵ ناوی سادە : نەخۆش، نازیرەک

- پێشگر + ناو : بێعەقڵ، نەفام
- ئاوەڵ ناو + ناو : خۆش‌بەخت، رەش‌بین
- ناو + ئاوەڵ ناو : رووسپی، سەربەرز
- ناو + ئامراز + ناو :کڵاو لەسەر، پاڵتاو لەبەر
- ئاوەڵ ناو + ئامراز + ئاوەڵ ناو : زەردوسوور، سوور و سپی، توند و تێژ
- ئاوەڵ ناوەکانی کارایی : زانا، وینەگر، خوێنەر، دەسگیر
- ئاوەڵ ناوەکانی بەرکاری :کوژراو، خنکاو، شکیاگ
- ئاوەڵ ناوەکانی نیسبەت : زێڕین،کوردستانی،کاروانچی
- ئاوەڵ ناوەکانی لیاقەت : شاهانە، خواردەمەنی

و....

*

## ئاوەڵ ناو لە ڕوانگەی موقابەلە و هەڵسەنگاندنەوە

لەو ڕوانگەوە ئاوەڵ ناو سێ نەوعە: ئاوەڵ ناوی ئاسایی، ئاوەڵ ناوی سەرتر، ئاوەڵ ناوی سەرترین.

### ١ـ ئاوەڵ ناوی ئاسایی

چۆنیەتی ناوێک بێ‌هەڵسەنگاندن لەگەڵ ناوێکی‌تردا ڕائەگەیەنێ.

وەک: زیرەک، شارەزا، زانا، باش، زۆر، فرە...

ئەو قوتابییە زیرەکە، هەوا تاریکە.

## ٢ـ ئاوەڵ ناوی سەرتر

چۆنیەتی ناوێک بەسەر ناوێکی‌تر لەو ئاوەڵ ناوەدا بە هەڵسەنگاندن بەیان ئەکاو نیشانەکەی «تر»ە، کە لە ئاخری ئاوەڵ ناوەکەوە ئەبینرێ.

وەک: ئازاتر، زیرەک‌تر، باشتر، زۆرتر، فرەتر.

ئەو پیاوە لەوەکەی‌تر، زیرەک‌ترە. ئەم پێنووسە ڕەوانترە.

## ٣ـ ئاوەڵ ناوی سەرترین

چۆنیەتی ناوێک بەر سەر ناوەکانی هاونەوعی لەو ئاوەڵ ناوەدا بە هەڵسەنگاندن بەیان ئەکاو نیشانەکەی «ترین»ە کە لە ئاخری ئاوەڵ ناوەکەوە ئەبینرێ.

وەک: ئازاترین، زیرەک‌ترین، باشترین، زۆرترین.

ئەمە باشترین ڕێگەیە، چالاک‌ترین یان ئەو کوڕەیە.

*

## ڕاهێنان:

١ـ بۆ ئەم ئاوەڵ ناوانە هەر یەک پێنج نموونە لە ڕستەدا بنووسن:

ئیشارە، پرسیار، نادیار، ژمارە، سەرترین، سەرسووڕێنەر، لەقەب.

٢ـ نەوعی ئەم ئاوەڵ ناوانە، ناوییەن:

کتێبی ئەدەبی، ئیشی ڕێکخراو، کاکەی کرێکار، مرۆڤی بینا، دەستەی هەشتەم، ماڵی خاوێن، کوڕ زیرەک، کێف بەرز.

٣ـ لەلاپەڕەیەکی ئەدەبی ڕێنووسی کوردیدا ئەنواعی ئاوەڵ ناوەکان بناسێنن.

*

## فەسڵی سێیەم: جێناو (= ضمیر)

جـێناو، وشـەیەکـی جـێنشینی نـاوە و لە رسـتەدا زۆربـەی دۆخ و حاڵەتەکانی ناو دەگرێ.

جێناوەکان ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| ١ـ جێناوی کەسی | (= ضمیر شخصی) |
| ٢ـ جێناوی خۆیی | (= ضمیر مشترك) |
| ٣ـ جێناوی ئیشارە | (= ضمیر اشارە) |
| ٤ـ جێناوی پرسیار | (= ضمیر پرسشی) |
| ٥ـ جێناوی سەرسوورِێنەر | (= ضمیر تعجّبی) |
| ٦ـ جێناوی نادیار | (= ضمیر مبهم) |
| ٧ـ جێناوی ژمارە | (= ضمیر شمارشی) |
| ٨ـ جێناوی هەیی | (= ضمیر ملکی یا تعلّقی) |
| ٩ـ جێناوی هاوبەشی | (= ضمیر متقابل یا مشارکت) |

*

## ناسینی جێناوەکان

### ١ـ جێناوی کەسی

ئەم جێناوە دوو نەوعە: جێناوی کەسی جودا ـ جێناوی کەسی لکاو.

### الف: جێناوی کەسی جودا

یەکەم کەسی تاک: **من** یەکەم کەسی کۆ: **ئێمە**

دووەم کەسی تاک: **تۆ** دووەم کەسی کۆ: **ئێوە**

سێیەم کەسی تاک: **ئەو** سێیەم کەسی کۆ: **ئەوان**

ئەم جێناوانە لە موکریانیدا بەمجۆرەن:

**ئەمن / من** **ئەمە / مە**

**ئەتۆ، ئەتوو / تۆ، توو** **ئەنگۆ / نگۆ**

**ئەو / وی** **ئەوان / وان**

### ب ـ جێناوی کەسی لکاو

ئەم جێناوە دوو نەوعە:

ـ نەوعی یەکەم

یەکەم کەسی تاک **ـم** یەکەم کەسی کۆ **ـمان**

دووەم کەسی تاک **ـت** دووەم کەسی کۆ **ـتان**

سێیەم کەسی تاک **ـی** سێیەم کەسی کۆ **ـیان**

- نەوعی دووەم

| | | | |
|---|---|---|---|
| یەکەم کەسی تاک | -م | یەکەم کەسی کۆ | -ین |
| دووەم کەسی تاک | -ی (-یت) | دووەم کەسی کۆ | -ن |
| سێیەم کەسی تاک | - ɸ، ێ(ێت)، ا(ات)، ت | سێیەم کەسی کۆ | -ن |

## تایبەتمەندییەکانی جێناوی کەسی لکاوی نەوعی یەکەم

١- ئەم جێناوانە دەلکێن بە ناوەو دەبن بە پاڵشتی ناوەکە (واتە: مضاف‌الیه)

**دەستم، دەستت، دەستی، دەستمان، دەستتان، دەستیان.**

واتە: دەستی من، دەستی تۆ، دەستی ئەو، دەستی ئێمە، دەستی ئێوە، دەستی ئەوان.

٢- دەلکێن بە ئاخری کرداری رابوردووی تێپەڕەوە و دەبن بە کارای کردارەکە.

**ناردم، ناردت، ناردی، ناردمان، ناردتان، ناردیان.**

واتە: من ناردم، تۆ ناردت، ئەو ناردی...

٣- ئەم جێناوانە لەگەڵ کرداری تێنەپەڕی ئێستاو رابوردوودا نایەن، بەڵکوو لەم دوو کردارەدا، جێناوەکانی نەوعی دووەم دەوریان هەیە (← تایبەتمەندی نەوعی دووەم «٣»).

٤- ئەم جێناوانە لەگەڵ کرداری ئێستای تێپەڕدانایەن، بەڵکو لەم کردارەدا جێناوەکانی نەوعی دووەم دەوریان هەیە. (← تایبەتمەندی

نەوعی دووەم «۴»).

٥ـ ئەم جێناوانە لە کرداری تێپەڕی رابوردووی بەردەوامدا، دەلکێنە پێشگری «ئە» یا «دە»ی بەردەوامەوە.

**ئەمنارد / دەمنارد، ئەتنارد / دەتنارد، ئەینارد / دەینارد ئەماننارد / دەمان نارد، ئەتاننارد / دەتاننارد، ئەیاننارد / دەیان نارد.**

٦ـ ئەم جێناوانە لەکرداری تێپەڕی رابوردووی سادەی مەنفیدا، دەلکێنە نیشانەی «نە»ی نەفییەوە.

**نەمنارد، نەتنارد، نەینارد، نەماننارد، نەتاننارد، نەیاننارد.**

٧ـ ئەم جێناوانە لە کرداری تێپەڕی رابوردووی بەردەوام و مەنفیدا، دەلکێنە نیشانەی «نە»ی نەفییەوە و پێشگری «ئە» یا «دە»ی بەردەوام، بە دوایاندا دێ.

**نەمدەنارد، نەتدەنارد، نەیدەنارد، نەماندەنارد، نەتاندەنارد، نەیاندەنارد.**

٨ـ ئەم جێناوانە لە کرداری رابوردووی ئیخباری تەواودا، دەکەونە پێش پیتی دەنگداری ئاخری کردارکە، واتە «ە».

**ناردوومە، ناردووتە، ناردوویە، ناردوومانە، ناردووتانە، ناردوویانە.**

٩ـ ئەم جێناوانە لە کرداری تێپەڕی رابوردووی ئینشایی بەردەوامدا، دەلکێنە نیشانەی «ب»ی ئینشایی کردارەکەوە.

**بمناردبایە، بتناردبایە، بیناردبایە، بماناردبایە،**

**بتان‌ناردبایە، بیان‌ناردبایە.**

١٠ـ ئەم جێناوانە لەکرداری لێکدواوی تێپەڕی رابوردوودا دەلکـنە ئاخری وشەی هەوەڵی کردارەکەوە.

**دەستم خست، دەستت خست، دەستی خست، دەستمان خست، دەستتان خست، دەستیان خست.**

بەڵام ئەگەر ئەم کردارە لێکـدراوە تـێپەرە بـڕواتـە زەمانی ئێستاوە، جێناوی نەوعی دووەم لەئاخری کردارەکەوە دەگرێ.

**دەستی ئەخەم، دەستی ئەخەی، دەستی ئەخا، دەستی ئەخەین، دەستی ئەخەن، دەستی ئەخەن.**

١١ـ ئەم جێناوانە لەکرداری پێشگرداری تێپەڕی رابوردوودا دەلکنە دوای پێشگرەکەوە.

**هەڵم‌ساند، هەڵت‌ساند، هەڵی‌ساند، هەڵمان‌ساند، هەڵتان‌ساند، هەڵیان‌ساند.**

بەڵام ئـەگـەر ئـەوکردارە پـێشگردارانـا بـبن بـە تێنەپەر، جـێناوی نەوعی دووەم دەگرن و جێناوەکەش دەلکێتە ئاخری کردارەکەوە.

**هەڵسام، هەڵسای، هەڵسا، هەڵساین، هەڵسان، هەڵسان.**

١٢ـ ئەم جێناوانە، لە هەر کردارێکدا دەوریان ببێ چ کرداری سادە یا پێشگردار یا لێکدراو، چ تێپەڕ و تێنەپەر، چ لە زەمانی رابوردوو یا ئێستا، بـــە گـــوێرەی چـــۆنیەتی کـــردارەکـــانەوە، هـــەرواکـــە نیشانمان‌دا، جێگەیان ئەگۆردرێ.

**تایبەتمەندییەکانی جێناوی کەسی لکاوی نەوعی دووەم**

١ـ ئەم جێناوانە تەنها لەگەل کردارا دێن و دەبن بەکارای کردارەکە.

**ڕۆیشتم، ڕۆیشتی، ڕۆیشت، ڕۆیشتین، ڕۆیشتن، ڕۆیشتن.**

٢ـ ئەم جێناوانە لەگەڵ کرداری رابوردووی تێپەڕدانەیان، بەڵکوو لەو کردارەدا جێناوی نەوعی یەکەم دەوری هەیە. (← تایبەتمەندی نەوعی یەکەم «٢»).

٣ـ ئەم جێناوانە دەلکن بەکرداری تێنەپەڕی رابوردوو و ئێستاوە.

ـ تێنەپەڕی رابوردوو: **هاتم، هاتی، هات، هاتین، هاتن، هاتن.**

ـ تێنەپەڕی ئێستا: **دێم، دێی، دێ، دێین، دێن، دێن.**

٤ـ ئەم جێناوانە دەلکن بەکرداری ئێستای تێپەڕەوە.

**دەنووسم، دەنووسی، دەنووسێ، دەنووسین، دەنووسن، دەنووسن.**

٥ـ ئەم جێناوانە لە هەر کردارێکدا، دەوریان ببێ، چ کرداری سادە یا پێشگردار یا لێکدراو، چ تێپەڕ یا تێنەپەڕ، چ لە زەمانی رابوردوو یا ئێستا، دەکەونە **ئاخری کردارەکەوە** و وەکوو جێناوەکانی نەوعی یەکەم بە گوێرەی چۆنیەتی کردارەکان، جێگەیان ناگۆڕدرێ.

٦ـ لەم نەوعە جێناوەدا، جێناوی سێیەم کەسی تاک بەپێی نەوع، زەمان (= کات)، **پیتی ئاخری کردارەکە**، ئەگۆڕدرێ:

٦ ـ ١ کرداری **تێنەپەر**، رابوردوو، **پیتی ئاخر بێدەنگ**، جێناوی سێیەم کەسی تاک نابینرێ = $\phi$ هاتم، هاتی، **هات**.

٦ ـ ٢ کرداری **تێنەپەر**، رابوردوو، **پیتی ئاخر دەنگداری «وو»**، جێناوی سێیەم کەسی تاک. نابینرێ = $\phi$.

**دەرچووم، دەرچووی، دەرچوو.**

٦ ـ ٣ کرداری تێپەڕ، ئێستا، پیتی ئاخر بێدەنگ، جێناوی سێیەم کەسی تاک = «ێ» یا «ێت».

**دەنووسم، دەنووسی، دەنووسێ (دەنووسێت).**

٦ ـ ۴ کرداری تێپەڕ یا تێنەپەر، ئێستا، پیتی ئاخر دەنگداری «ۆ»، جێناوی سێیەم کەسی تاک = «ا» یا «ات».

**تێپەڕ: ئەخۆم، ئەخۆی، ئەخوا (ئەخوات).**

**تێنەپەڕ: دەڕۆم، دەڕۆی، دەڕوا (دەڕوات).**

**تێبینی:** لە سێیەم کەس‌دا، «ۆ» گۆڕاوە بە «و»

٦ ـ ۵ پیتی ئاخری کردار، دەنگداری «ێ»، جێناوی سێیەم کەسی تاک = $\phi$ یا «ت» دێم، دێی، دێ (دێت).

٧ـ دووەم کەسی کۆ و سێیەم کەسی کۆ لەم جێناوانەدا، یەک نیشانەیان هەیە و ئەوە «ـــِ ن»ە، کە لە ڕستەدا لەرووی قەرینەوە دەناسرێن.

وەک: ئێوە هاتن، ئەوان هاتن، دوو قەرینەی «ئێوە»، «ئەوان» ژمارەی کەسەکان بەیان دەکەن.

*

## ٢ـ جێناوی خۆیی

ئەم جێناوە لە زمانی کوردیدا یەک نیشانەی هەیە: «خۆ».

**تایبەتمەندییەکانی ئەم جێناوە**

١ـ بۆ هەر شەش کەسی تاک و کۆ، وەکوو یەک بەکار ئەبرێ.

**خۆم هاتم، خۆت هاتی، خۆی هات، خۆمان هاتین، خۆتان هاتن، خۆیان هاتن.**

٢ـ ئەم جێناوە، بێ‌لکاندن بە وشەیەکی‌ترەوە، دەتوانێ لە ڕستەدا نەقشی ڕێزمانی ببێ:

«خۆ» لە من گوم دکا. ← «خۆ» لەم ڕستەدا بەرکاری ڕستەکەیە.

٣ـ «خۆ» دەتوانێ بەشێ لە وشەی لێکدراو بێ کە لێرەدا جێناوی خۆیی نی‌یە. وەک:

**«خۆگری»، «خۆبینی».**

٤ـ «خۆ» لەگەڵ جێناوەکانی کەسی نەوعی یەکەمدا تەرکیب ئەبێ و مەعنای تەئکیدی ئەدا بە جێناوە کەسی‌یەکە:

**خۆم، خۆت، خۆی... خۆم ناردم، خۆمان بردمان.**

٥ـ لەگەڵ جێناوە کەسی‌یەکانی جودا و لکاودا بەگشتی تەرکیب ئەبێ.

**من خۆم هاتم، ئێوە خۆتان وتتان، خۆمم هاتم، خۆیانن هاتن.**

*

**٣ـ جێناوی ئیشارە**

ئەم جێناوە ئیشارە دەکا بۆ نزیک یا دوور و دوو نیشانەی هەیە:

بۆ نزیک: **ئەم، (ئەمە)**

بۆ دوور: **ئەو، (ئەوە)**

**تایبەتمەندییەکانی ئەم جێناوە**

١ـ بەدوای ئەم جێناوانەدا، ناونایەت، وە ئەگەر ناو بەدوایانا بێت ئەبن بە ئاوەڵ ناوی ئیشارە.

جێناو وەک: ئەم رۆیشت ئەو هات

ئاوەڵناو وەک: ئەم کتێبە ئەو پیاوە

٢ـ ئەم جێناوانە نیشانەی کۆ دەگرن.

ئەمان (ئەمانە)، ئەوان (ئەوانە): ئەمان هاتن، ئەوان رۆیشتن.

بەڵام ئاوەڵ ناوی ئیشارە، نیشانەی کۆ ناگرێ و نیشانەی کۆ ئەدرێ بە ناوەکەی دوای.

**ئەم پیاوە ← ئەم پیاوانە، ئەو خانووە ← ئەو خانووانە.**

٣ـ ئەم جێناوانە لەگەڵ جێناوی کەسی لکاوی نەوعی یەکەمدا تەرکیب ئەبن.

**ئەمەم، ئەوەت، ئەوەی، ئەمەمان، ئەمەتان، ئەمەیان.**

٤ـ ئەم جێناوانە لەگەڵ «ش» یا «یش»دا تەرکیب ئەبن.

**ئەمەش / ئەمەیش، ئەوەش / ئەوەیش، ئەمانەش / ئەمانەیش، ئەوانەش / ئەوانەیش.**

٥ـ ئەم جێناوانە لەگەڵ «ش» و «یش» و جێناوی کەسی لکاوی نەوعی یەکەمدا کۆ دەبنەوە.

**ئەمەشم، ئەمەشت، ئەمەشی، ئەمەشمان، ئەمەشتان، ئەمەشیان، ئەمەیشم، ئەمەیشت، ئەمەیشی...**

*

## ٤ـ جێناوی پرسیار

ئەم جێناوە لە چۆنیەتی و چەندێتی و ئەندازە، پرسیار دەکا.

کێ؟ چی؟ چِ؟ کام؟ کامە؟ کەی؟ چۆن؟ چلۆن؟ کۆی؟ چەند؟ چەن؟ چە؟

### تایبەتمەندییەکانی ئەم جێناوە

١ـ ئەو وشانە کاتێ جێناون کە ناوی پرسیار لێ کراو بەشوێنیاندا نەهاتبێ.

چیت وت؟ کەی دێی؟ کامیان هاتن؟ کێ ئەڕوا؟

ئەگەر ناو بە شوێنیاندا بێ، ئەبن بە ئاوەڵ ناوی پرسیار.

وەک: کام کەسیان هاتن؟ چەند پێنووست سەند؟

٢ـ ئەم جێناوانە لەگەڵ جێناوەکە سییەکاندا کۆ ئەبنەوە.

**ـ چیم وت، چیت وت، چی مان وت، چی تان وت، چی یان وت.**

**ـ کێم، کێی، کێیە، کێین، کێن، کێن.**

**ـ کام تان مان، چی تان یان،**

**ـ چی مانن، چی تانن، کام یانی**

*

## ٥ـ جێناوی سەرسوورێنەر

لە ناوێ وا لە رستەدا نەهاتووە، سەرسووڕی خۆی ڕادەگەیەنێ و دوو وشەی هەیە: چِ! چەن! چِ باش! چەن شیرین!

*

## ٦ـ جێناوی نادیار

ئەم جێناوە لە چۆنیەتی یا ژمارە یا ئەندازەی کەسێ یا چتێکی نادیار باس دەکا.

**وشەکانی ئەمانەن:**

**هەرکەس، کەسێ، هەموو، هیچ، هیچکام، هیچ یەک، گشت، بەعزێ، هەندێ، برێ، شەخسێ، نەختێ، کەمێ، گەلێ، کابرا، ئەمو ئەو، فلانی و...**

هەرکەس ئەڕوا با بڕوا، ئەم و ئەو لەو بارەوە زۆریان وتووە.

## ٧ـ جێناوی ژمارە

ئەگەر ژمارەکان لەرستەدا سەربەخۆو بێ هاوڕێ بوون لەگەڵ ناودا بێن و نەقشی ڕێزمانی بگرن، جێناوی ژمارەیان پێ ئەوترێ. وەک:

| | |
|---|---|
| ئەو لە ئەزموونەدا بیستی گرت | (بیست: ژمارەی سەرەکی / بەرکار) |
| کێ دووەمە؟ | (دووەم:ژمارەیڕوتبی/پاڵدراو،موسنەد) |
| هەوەڵینیان هات | (هەوەڵین: ژمارەی ڕوتبی /کارا) |
| چوار چوار هاتن | (چوار چوار: ژمارەی دابەشی /کارا) |

*

## ٨ـ جێناوی هەیی

ئەم جێناوە، خۆیەتی (واتە: تەمەللوک) ڕادەگەیەنێ و دوو وشەی هەیە: «هی»، «هین».

«هـــی» وشـەیەکـی گشـتی سـۆرانـی‌یە و «هـین» لە زاراوەی سنەیی (ئەردەڵانی)دا ئەوترێ.

ئەو کتێبە هی ئەوە، ئەوە هین ئێمەس

*

## ٩ـ جێناوی هاوبەشی

ئـەم جـێناوە هـاوبەشی دوو یـا چـەند کـەس لە ئـەنجامی کـارێکدا ڕادەگەیەنێ و وشەیەکی هەیە: «یەکتر». وەک: یەکتریان دی.

ئەو وشە دەش‌توانێ ببێ بە «یەکتری»، «یەکترین».

یەکتریان دی، یەکترینیان دی.

ئەم جێناوە دەتوانێ، جێناوی لکاو و نیشانەی «ش» و «یش» وەربگرێ.

یەکتریشمان دی ـ یەکتریشتان دی.

*

## ڕاهێنان

١ـ گەردانی ئەم چاوگانە لەکاتی رابوردوودا بنووسن و جێناوە کەسییەکانیان بناسێنن: (سەندن، هاتن، کەوتن، ناردن، تێ گەیشتن، ڕاپەڕاندن).

٢ـ گەردانی ئەو چاوگانە لەکاتی رانەبوردوودا بنوسن و جێناوە کەسییەکانیان بناسێنن.

٣ـ جیاوازی جێناوی ئیشارە و ئاوەڵ ناوی ئیشارە لە چەند نموونەدا بەیان بکەن.

*

# فەسڵی چوارەم: کردار (= فعل)

کردار وشەیەکە، کە چەند تایبەتمەندی تێدا بە دی ئەکرێ:

١ـ کات (= زەمان) ٢ـ کەس ٣ـ ڕواڵەت ٤ـ چۆنیەتی ئەنجامی کردار.

وەک: ڕۆیشتم ← ١ـ کات: رابوردوو ٢ـ کەس: یەکەم کەسی تاک. ٣ـ ڕواڵەت: سادە (لە چاوگی رۆیشتن) ٤ـ چۆنیەتی: کرداری سەرگرتوو، تێنەپەڕ

هەڵی ناگرین ← ١ـ کات: ئێستا ٢ـ کەس: یەکەم کەسی کۆ ٣ـ رواڵەت: پێشگردار (لە چاوگی هەڵگرتن) ٤ـ چۆنیەتی: کرداری مەنفی، تێپەڕ.

## تایبەتمەندییەکان

### ١ـ کات

لە زمانی کوردی‌دا بۆ کردار دووکاتی: «رابوردوو، ئێستا» هەیە و کرداری ئێستا بۆ کاتی داهاتوو واتە موستەقبەلیش بەکار ئەبرێ و قەرینە لە رستەدا نیشانی ئەدا کە مەبەست لەو کردارە، ئێستایە (واتە حاڵ) یا داهاتووە (واتە موستەقبەل) وەک:

ـ خەریکم دەنووسم (خەریکم: قەرینەیە بۆ ئێستا)

ـ سبەی دەنووسم (سبەی: قەرینەیە بۆ داهاتوو)

## ٢ـ کەس

لەگەڵ هەر کردارێکدا یەکێ لە جێناوەکانی کەسی لکاوی نەوعی یەکەم یا دووەم بەکار ئەبرێ و ئەو جێناوە تاک و کۆو ژمارەی کەسەکە نیشان ئەدا.

### نموونە بۆ کردار لەگەڵ جێناوی نەوعی یەکەم:

| تاک / کۆ | ژمارەی کەس | جێناوی ١ | نموونەی کردار |
|---|---|---|---|
| تاک | یەکەم | ـم | هاوردم، بردم، دامخست، دەستمکەوت |
| | دووەم | ـت | هاوردت، بردت، داتخست، دەستتکەوت |
| | سێیەم | ـی | هاوردی، بردی، دایخست، دەستیکەوت |
| کۆ | یەکەم | مان | هاوردمان، بردمان، دامانخست، دەستمانکەوت |
| | دووەم | تان | هاورتان، بردتان، داتانخست، دەستتانکەوت |
| | سێیەم | یان | هاوردیان، بردیان، دایانخست، دەستیانکەوت |

### نموونە بۆ کردار لەگەڵ جێناوی نەوعی دووەم:

| تاک / کۆ | ژمارەی کەس | جێناوی ٢ | نموونەی کردار |
|---|---|---|---|
| تاک | یەکەم | ـم | هاتم، دەخوێنم، هەڵی ئەخەم |
| | دووەم | ـی | هاتی، دەخوینی، هەڵی ئەخەی |
| | سێیەم | ← | هات $\phi$، دەخوینێ، هەڵی ئەخا (ت) |
| کۆ | یەکەم | ـین | هاتین، دەخوێنین، هەڵی ئەخەین |
| | دووەم | ـن | هاتن، دەخوێنن، هەڵی ئەخەن |
| | سێیەم | ـن | هاتن، دەخوێنن، هەڵی ئەخەن |

## ٣ـ رواڵەتی کردار

کردارەکان لە روانگەی رواڵەتەوە بریتین لە: سادە، ناسادە. کرداری سادە و ناسادە لە رووی چاوگەی کردارەکەوە دەناسین، وەک:

هاتم ← لە چاوگەی «هاتن» گیراوەو «سادە»یە.

دەرچووم ← لەچاوگەی «دەرچوون» گیراوەو «ناسادە یا پێشگردار»ە.

دەستی خست ← لە چاوگەی «دەستخستن» گیراوەو «ناسادە یا لێکدراو»ە.

١ـ کرداری سادە، کردارێکی یەک وشەیییەو عەینی کردارەکەیە.

وەک: خوێندم (خوێندن)، نووسیمان (نووسین)، بردتان (بردن) هێنایان (هاوردن).

٢ـ کرداری ناسادە، ئەم کردارە دوو نەوعە: پێشگردار، لێکدراو.

٢ ـ ١ کرداری ناسادەی پیشگردار، دروست بووە لە پێشگرێک و کردارێکی سادە.

وەک: دەرمخست (دەرخستن)، راپەڕین (راپەڕین) هەڵکەوت (هەڵکەوتن).

٢ ـ ٢ کرداری ناسادەی لێکدراو، دروست بووە لە ناو یا ئاوەڵ ناو یا ئاوەڵکارێک لەگەڵ کردارێکی سادەدا.

وەک: فێربووم (فێربوون) پەیدایان کرد (پەیداکردن)، سەرکەوتین (سەرکەوتن).

ـ لەکرداری لێکدراودا ئامرازی ئیزافە یا پێشگریش ئەبینرێ

وەک: دەستی لێ دا (دەستلێدان)، دەستمان لێ هەڵگرت (دەست لێهەڵگرتن).

**تێبینی:** ئەم نیشانانەی خوارەوە، ڕواڵەتی کردار ناکەن بە «ناسادە» چونکە چاوگەکەیان سادەیە:

- «ئە»، «دە»ی نیشانەی ڕابوردووی بەردەوام یا ئێستای ئێخباری
وەک: ئەمنووسی، دەی‌نووسی، ئەڕۆم، دەڕۆن.
- «نا»، «نە»ی نیشانەی نەفی.
وەک: نانووسم، نەی‌خوێند
- «مە»ی نیشانەی نەهی.
وەک: مەخوێنە، مەڕۆ.
- «ب»ی نیشانەی ئەمرو ئینشایی.
وەک: بنووسە، بم‌نووسیبا

## ٤ـ چۆنیەتی ئەنجامی کردار

لەم ڕوانگەوە کردار ئەبێ بە دوو نەوع: تێنەپەڕ، تێپەڕ.

- کرداری تێنەپەڕ (= لازم) ـ ئەو کردارەیە کە مەعناو ئەنجامەکەی بە کارا (= فاعل) تەواو ئەبێ و نیازی بە بەرکار (= مفعول) نییە.
وەک: پەروین هات، پەرویز ڕۆیشت
- کرداری تێپەڕ (= متعدّی) ـ ئەو کردارەیە کە مەعناو ئەنجامەکەی بە بەرکار تەواو ئەبێ.
وەک: ئازاد کتێبەکەی هاورد، پەروانە دەرسەکەی خوێند.

*

## ئەنواعی کردار لە روانگەی کات یا زەمانەوە

لە زمانی کوردیدا کردار لە روانگەی کاتەوە دوو نەوعە:

رابوردوو ـ ئێستا (= رانەبوردوو)

### الف ـ کرداری رابوردوو

ئەم کردارە دوو دەستەیە ۱ـ رابوردووی ئیخباری ۲ـ رابوردووی ئینشایی

### ۱ـ رابوردووی ئیخباری پێنج نەوعە:

۱ ـ ۱ رابوردووی ئیخباری نزیک

۱ ـ ۲ رابوردووی ئیخباری بەردەوام

۱ ـ ۳ رابوردووی ئیخباری تەواو

۱ ـ ۴ رابوردووی ئیخباری دوور

۱ ـ ۵ رابوردووی ئیخباری بەردەوامی ناتەواو

### ۲ـ رابوردووی ئینشایی چوار نەوعە:

۲ ـ ۱ رابوردووی ئینشایی نزیک

۲ ـ ۲ رابوردووی ئینشایی بەردەوام

۲ ـ ۳ رابوردووی ئینشایی تەواو

۲ ـ ۴ رابوردووی ئینشایی دوور

*

## گەردانی کرداره رابوردووەکان

### ١ ـ ١ رابوردووی ئیخباری نزیک

| کەس / کردار | | ١ی تاک | ٢ی تاک | ٣ی تاک | ١ی کۆ | ٢ی کۆ | ٣ی کۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سادە | تێنەپەڕ | هاتم | هاتی | هات | هاتین | هاتن | هاتن |
| | تێپەڕ | خوێندم | خوێندت | خوێندی | خوێندمان | خوێندتان | خوێندیان |
| پێشگردار | تێنەپەڕ | دەرکەوتم | دەرکەوتی | دەرکەوت | دەرکەوتین | دەرکەوتن | دەرکەوتن |
| | تێپەڕ | دامگرت | داتگرت | دایگرت | دامانگرت | داتانگرت | دایانگرت |
| لێکدراو | تێنەپەڕ | تووشبووم | تووشبووی | تووشبوو | تووشبووین | تووشبوون | تووشبوون |
| | تێپەڕ | دەستمخست | دەستتخست | دەستیخست | دەستمانخست | دەستتانخست | دەستیانخست |

## ١ ـ ٢ رابوردووی ئیجباری بەردەوام

| کردار \ کەس | | ١ی تاک | ٢ی تاک | ٣ی تاک | ١ی کۆ | ٢ی کۆ | ٣ی کۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سادە | تێنەپەڕ | دەخەوتم | دەخەوتی | دەخەوت | دەخەوتین | دەخەوتن | دەخەوتن |
| | تێپەڕ | دەمنووسی | دەتنووسی | دەینووسی | دەماننووسی | دەتاننووسی | دەیاننووسی |
| پێشگردار | تێنەپەڕ | هەڵدەکەوتم | هەڵدەکەوتی | هەڵدەکەوت | هەڵدەکەوتین | هەڵدەکەوتن | هەڵدەکەوتن |
| | تێپەڕ | دامدەخست | داتدەخست | دایدەخست | داماندەخست | داتاندەخست | دایاندەخست |
| لێکدراو | تێنەپەڕ | سەردەکەوتم | سەردەکەوتی | سەردەکەوت | سەردەکەوتین | سەردەکەوتن | سەردەکەوتن |
| | تێپەڕ | ڕێکمدەخست | ڕێکتدەخست | ڕێکیدەخست | ڕێکماندەخست | ڕێکتاندەخست | ڕێکیاندەخست |

## ١ - ٣ ڕابوردووی ئیخباری تەواو

| کەس / کردار | | ١ی تاک | ٢ی تاک | ٣ی تاک | ١ی کۆ | ٢ی کۆ | ٣ی کۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سادە | تێنەپەڕ | هاتووم | هاتووی | هاتووە | هاتووین | هاتوون | هاتوون |
| | تێپەڕ | خوێندوومە | خوێندووتە | خوێندوویە | خوێندوومانە | خوێندووتانە | خوێندوویانە |
| پێشگردار | تێنەپەڕ | دەرکەوتووم | دەرکەوتووی | دەرکەوتووە | دەرکەوتووین | دەرکەوتوون | دەرکەوتوون |
| | تێپەڕ | دامگرتووە | داتگرتووە | دایگرتووە | دامانگرتووە | داتانگرتووە | دایانگرتووە |
| لێکدراو | تێنەپەڕ | سەرکەوتووم | سەرکەوتووی | سەرکەوتووە | سەرکەوتووین | سەرکەوتوون | سەرکەوتوون |
| | تێپەڕ | دەستمخستووە | دەستتخستووە | دەستیخستووە | دەستمانخستووە | دەستتانخستووە | دەستیانخستووە |

### ١ ـ ٤ رابوردووی ئیخباری دوور

| کەس / کردار | | ١ی تاک | ٢ی تاک | ٣ی تاک | ١ی کۆ | ٢ی کۆ | ٣ی کۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سادە | تێنەپەڕ | هاتبووم | هاتبووی | هاتبوو | هاتبووین | هاتبوون | هاتبوون |
| | تێپەڕ | خوێندبووم | خوێندبووت | خوێندبووی | خوێندبوومان | خوێندبووتان | خوێندبوویان |
| پێشگردار | تێنەپەڕ | دەرکەوتبووم | دەرکەوتبووی | دەرکەوتبوو | دەرکەوتبووین | دەرکەوتبوون | دەرکەوتبوون |
| | تێپەڕ | دامگرتبوو | داتگرتبوو | دایگرتبوو | دامانگرتبوو | داتانگرتبوو | دایانگرتبوو |
| لێکدراو | تێنەپەڕ | تووشبووم | تووشبووی | تووشبوو | تووشبووین | تووشبوون | تووشبوون |
| | تێپەڕ | دەستمخستبوو | دەستتخستبوو | دەستیخستبوو | دەستمانخستبوو | دەستتانخستبوو | دەستیانخستبوو |

### ١ ـ ٥ رابوردووی ئیخباری بەردەوامی ناتەواو

ئەم کردارە بەم شێوازە پێکدێ:

گەردانی خەریک بوون + رابوردووی ئیخباری بەردەوام

وەک: خەریک بووم دەخەوتم، خەریک بووی دەخەوتی، خەریک بوو دەخەوت...

خەریک بووم دەمنووسی، خەریک بووی دەتنووسی، خەریک بوو دەینووسی...

ئەم کردارە، رابوردووی ئیخباری بەردەوام بە شێوازی ناتەواو رادەگەیەنێ و لە ڕستەدا لەگەڵ ئەم کردارەدا، کردارێکی تریش دێتە ئاراوە.

وەک: خەریک بووم دەمنووسی کە ئەو هات.

## ٢ ـ ١ رابوردووی ئینشایی نزیک

ـ هاتبام، هاتبای، هاتبا، هاتباین، هاتبان، هاتبان.

ـ خوێندبام، خوێندبات، خوێندبای، خوێندبامان، خوێندباتان، خوێندبایان.

ـ دەرکەوتبام، دەرکەوتبای، دەرکەوتبا، دەرکەوتباین، دەرکەوتبان، دەرکەوتبان.

ـ تووش بووبام، تووش بووبای، تووش بووبا، تووش بووباین، تووش بووبان، تووش بووبان.

## ٢ ـ ٢ رابوردووی ئینشایی بەردەوام

ـ بهاتمایە، بهایتایە، بهاتایە، بهایتینایە، بهاتنایە، بهاتنایە.

ـ بمخوێندبایە، بتخوێندبایە، بیخوێندبایە، بمانخوێندبایە، بتانخوێندبایە، بیانخوێندبایە.

ـ دەربکەوتمایە، دەربکەوتیتایە، دەربکەوتایە، دەربکەوتینایە، دەربکەوتنایە، دەربکەوتنایە.

ـ تووشببوومایە، تووش ببوویتایە، تووش ببوایە، تووش ببووینایە، تووشببوونایە، تووشببونایە.

تێبینی: رواڵەتی گەردانی دەستەی (بمخوێندبایە... دەربکەوتمایە...

تووش ببوومایە...) بەم جۆرەش ئەبێ:
- بمخوێندایە، بتخوێندایە، بیخوێندایە...
- دەربکەوتبامایە، دەربکەوتبایتایە، دەربکەوتبایە...
- تووشببوامایە، تووش ببوایتایە، تووش ببواتایە...

## ٢ـ٣ رابوردووی ئینشایی تەواو

- هاتبێتم، هاتبێتی، هاتبێ، هاتبێتین، هاتبێتن، هاتبێتن.
- خوێندبێتم،خوێندبێت،خوێندبێتی،خوێندبێتمان،خوێندبێتتان، خوێندبێتیان.
- دەرکەوتبێتم، دەرکەوتبێتی، دەرکەوتبێت، دەرکەوتبێتین، دەرکەوتبێتن، دەرکەوتبێتن.
- تووشبووبێتم، تووشبووبێتی، تووشبووبێ، تووشبووبێتین، تووشبووبێتن، تووشبووبێتن.

## ٢ـ٤ رابوردووی ئینشایی دوور

- هاتبوومایە، هاتبوویتایە، هاتبووایە، هاتبووینانە، هاتبوونایە، هاتبوونایە.
- خوێندبوومایە، خوێندبووتایە، خوێندبوویایە، خوێندبوومانایە، خوێندبووتانایە، خوێندبوویانایە.
- دەرکەوتبوومایە، دەرکەوتبوویتایە، دەرکەوتبوایە، دەرکەوتبووینایە، دەرکەتبوونانە، دەرکەوتبوونایە.
- تووش ببوومایە، تووشبوویتایە، تووش ببوایە، تووش ببووینایە، تووش بوونایە، تووش بوونایە.

*

ب ـ کرداری ئێستا (= رانەبوردوو)

ئەم کردارە سێ نەوعە: ١ـ ئێستای ئیخباری ٢ـ ئێستای ئینشایی ٣ـ فەرمان (= ئەمر).

## ١ـ ئێستای ئیخباری

| کەس / کردار | | ١ی تاک | ٢ی تاک | ٣ی تاک | ١ی کۆ | ٢ی کۆ | ٣ی کۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سادە | تێنەپەڕ | دە(ئە)ڕۆم | دە(ئە)ڕۆی | دە(ئە)ڕوا | دە(ئە)ڕۆین | دە(ئە)ڕۆن | دە(ئەڕۆن |
| | تێپەڕ | دە(ئە)خوێنم | دە(ئە)خوێنی | دە(ئە)خوێنێ | دە(ئە)خوێنین | دە(ئە)خوێنن | دە(ئە)خوێنن |
| پێشگردار | تێنەپەڕ | دەردە(ئە)کەوم | دەردە(ئە)کەوی | دەردە(ئە)کەوێ | دەردە(ئە)کەوین | دەردە(ئە)کەون | دەردە(ئە)کەون |
| | تێپەڕ | دادە(ئە)گرم | دادە(ئە)گری | دادە(ئە)گرێ | دادە(ئە)گرین | دادە(ئە)گرن | دادە(ئە)گرن |
| لێکدراو | تێنەپەڕ | تووش دە(ئە)بم | تووش دە(ئە)بی | تووش دە(ئە)بێ | تووش دە(ئە)بین | تووش دە(ئە)بن | تووش دە(ئە)بن |
| | تێپەڕ | دەست دە(ئە)خەم | دەست دە(ئە)خەی | دەست دە(ئە)خا | دەست دە(ئە)خەین | دەست دە(ئە)خەن | دەست دە(ئە)خەن |

## ٢ـ ئێستای ئینشایی

ـ بڕۆم، بڕۆی، بڕوا، بڕۆین، بڕۆن، بڕۆن.

ـ بخوێنم، بخوێنی، بخوێنێ، بخوێنین، بخوێنن، بخوێنن.

ـ دەربکەوم / دەرکەوم، دەربکەوی / دەرکەوی، دەربکەوێ / دەرکەوێ،...

ـ تووش ببم / تووش بم، تووش ببی / تووش بی، تووش ببێ / تووش بێ،...

## ٣ـ فەرمان (= امر)

ئەم کردارە، بۆ دوو کەس بەکار دەبرێ: دووەم کەسی تاک، دووەم کەسی کۆ.

ـ دووەم کەسی تاک: بڕۆ، بخوێنە، دەربکەوە (دەرکەوە)، تووش ببە (تووش‌بە)

ـ دووەم کەسی کۆ: بڕۆن، بخوێنن، دەربکەون (دەرکەون)، تووش ببن (تووش بن).

بۆ فەرمان بە کەسانی‌تر لە کرداری ئێستای ئیشنایی کەڵک وەردەگیرێ.

وەک: ئەبێ بڕۆم، ئەبێ بڕوا، ئەبێ بڕۆین، ئەبێ بخوێنێ، ئەبێ بخوێنین.

*

## کرداری نەهی (= فعل نهی)

بەلابردنی نیشانەی «ب» لەسەر کرداری فەرمان (= ئەمر) و دانانی نیشانەی «مە» لەسەر ئەوکردارە، کرداری نەهی دروست ئەبێ.

بڕۆ ـ ب = ڕۆ + پێشگری «مە»ی نەهی = مەڕۆ ← کرداری نەهی.

بخوێنە ـ ب = خوێنە + پێشگری «مە» ی نەهی = مەخوێنە ← کرداری نەهی.

ئەم کردارەش وەکوو کرداری فەرمان، بۆ دوو کەس بەکار دەبرێ: دووەم کەسی تاک و کۆ.

*

## کرداری نەفی (= فعل نفی)

هەموو کردارەکان بە زیادکردنی نیشانەی «نە» یا «نا» مەنفی ئەبن، بەلام نیشانەی «نە» بۆ مەنفی‌کردنی کرداری رابوردووە و نیشانەی «نا» بۆ مەنفی‌کردنی کرداری رانەبوردووە.

رابوردوو:

خوێندم ← نەمخوێند

هاتم ← نەهاتم

دامگرت ← دام نەگرت

دەستم خست ← دەستم نەخست

رانەبوردوو:

دەخوێنم ← ناخوێنم

دێم ← نایەم

دای ئەگرم ← دای ناگرم

دەستی ئەخەم ← دەستی ناخەم

بڕۆم ← ناڕۆم

تێبینی: جێگەی نیشانەی نەفی «نە» یا «نا» لە کردارەکاندا بەپێی ڕواڵەتی کردارەکان، جیاوازە.

*

## کرداری ناپەیدا (= فعل مجهول)

کرداری تێپەڕ لە ڕستەدا دوو دەوری هەیە: یاکارای ئەو کردارە بە ئاشکرایی دەناسرێ کە پێی ئەوترێ کرداری پەیدا (= معلوم).

وەک: ئەو دەرسەکەی خوێند ← ئەو: کارا / دەرس: بەرکار / خوێند: کرداری پەیدا.

یاکارا لە ڕستەکەدا ئاشکرا نییە و ناناسرێ و نیسبەتی کردارەکە ئەدرێتە لای بەرکارەوە و بەوکردارە تێپەڕە ئەوترێ: کرداری ناپەیدا (= مجهول).

وەک: دەرسەکە خوێنراوە ← دەرس: بەرکار / خوێنرا: کرداری ناپەیدا.

لەم ڕستەدا، بەرکار، ئەبێ بە جێگری کارا (= نایب فاعل).

کرداری ناپەیدا وەک:

- نووسرا (دەنووسرا)، خوێنرا (دەخوێنرا)، کوژرا (دەکوژرا)، وترا (دەوترا)، بیسرا (دەبیسرا)... ← بۆ رابوردوو.

- دەنووسرێ، دەخوێنرێ، دەکوژرێ، دەوترێ، دەبیسرێ... ← بۆ رانەبوردوو.

*

## رەگی کردار (= ریشۀ فعل)

بۆ هەرکردارێ دوو رەگ دروست ئەبێ: رەگی رابوردوو، رەگی ئێستا شێوازی دروستبوونی ئەو دوورەگە:

### ١-رەگی رابوردوو

| | |
|---|---|
| - چاوگی کردار - ن | = رەگی رابوردوو |
| : خوێندن - ن | = خوێند |
| : ناردن - ن | = نارد |
| : هاتن - ن | = هات |
| : دەرکەوتن - ن | = دەرکەوت |
| : رێکخستن - ن | = رێکخست |

## ٢ـ رەگی ئێستا

ـ کرداری فەرمان (= ئەمر)ی دووەم کەسی تاک ـ «ب»ی ئەمر = رەگی ئێستا.

ـ کرداری فەرمان (= ئەمر)ی دووەم کەسی تاک ـ «ب»ی ئەمر ـ «ە»ی پاشگر = رەگی ئێستا.

: بڕۆ ـ ب = ڕۆ

: بخوێنە ـ ب ـ ە = خوێن

: بنێرە ـ ب ـ ە = نێر

: دەربکەوە ـ ب ـ ە = دەرکەو

رەگی رابوردوو لە تەواوی کردارەکانی رابوردوودا وەک بناغەی کردارەکان ئەبنیرێ و هەروا رەگی ئێستاش لە تەواوی کردارەکانی ئێستادا، بناغەی کردارەکانە.

وەک: خوێندم ← خوێند (رەگی رابوردوو) + م (جێناو)

دەخوێنم ← دە (پێشگری ئێستا) + خوێن (رەگی ئێستا) + م (جێناو)

*

## ڕاهێنان:

١ـ لەم چاوگانە: (بەردان، سووتان، ناردن، بیستن، تاشین)
ئەم کردارانە دروست بکەن:
ـ ئیخباری رابوردووی بەردەوام (بۆ هەر شەش کەسەکە)
ـ ئینشایی رابوردووی تەواو (بۆ هەر شەش کەسەکە)
ـ کرداری ئەمر
ـ کرداری نەهی
ـ کرداری ئیخباری رانەبوردوو یا ئێستا (بۆ هەر شەش کەسەکە)
٢ـ رەگی ئێستاو رەگی رابوردووی ئەوچاوگانە (ژمارە یەک) بنووسن.

* * *

## فەسڵی پێنجەم: ئاوەڵکار (= قید)

ئاوڵکار وشە یا وشەهایەکە لە رستەدا دێت و تایبەتمەندییەکی تازە ئەبەخشێ بەکردار یا یەکێکی‌تر لە وشەکانی رستەکە.

وەک: ـ ئەو زۆر ئازایە: «زۆر» ئاوڵکارە بۆ ئاوەڵناوی «ئازا» و چەندێتی ئاوڵناوەکە رادەگەیەنێ.

ـ ئاراز خێرا هات.: «خێرا» ئاوەڵکارە بۆ کرداری «هات» و چۆنیەتی کردارەکە رادەگەیەنێ.

ـبەداخەوە ئەوان نەهاتن. «بەداخەوە» ئاوەڵکارە بۆ تەواوی رستەکەو پەژارەی وێژەر لە نەهاتنی ئەوان رادەگەیەنێ.

### ئەنواعی ئاوەڵکار

ئاوەڵکار لەسێ روانگەوە جێگەی سەرنجە

١ـ روانگەی مەعنایی ٢ـ روانگەی رواڵەتی ٣ـ روانگەی تایبەتی و هاوبەشی

## ١ـ ئاوەڵکار لە روانگەی مەعنایی یەوە:

- ئاوەڵکاری کات. وەک: ئێستا، ئەمڕۆ، دوێنێ، پێرێ، پارەکە، دوێکە...
- ئاوەڵکاری شوێن یا جێگە. وەک: ئێرە، ئەوێ، ئێنە، ئەگرە، لێرە، لەوێ، لێنە...
- ئاوەڵکاری تەئکید. وەک: ئەڵبەت، حەتمەن، بێ‌قسە، بێ گومان، بەیەقین.
- ئاوەڵکاری چۆنیەتی. وەک: هێواش، توند، خێرا، پیاوانە، زیرەکانە...
- ئاوەڵکاری نەفی. وەک: هەرگیز، قەت، قەد، هیچ، نا، نە، نەخێر.
- ئاوەڵکاری ئەندازە وەک: نەختێ، کەمێ، کەم، زۆر...
- ئاوەڵکاری پرسیار وەک: چۆن، چلۆن، بۆچی، بۆچە، مەگەر، ئایا.
- ئاوەڵکاری تەرتیب وەک: هەوەڵ، یەکەم، یەکەمین، دوایی، گرۆگرۆ، دەستەدەستە.
- ئاوڵکاری دووپات وەک: دووپات، لەسەرەوە، دووبارە، بەین‌بەین، هەمووجار.
- ئاوەڵکاری عیللەت وەک: بۆ ئەوەی، لەبەر ئەوەی، چونکە، ناچار...
- ئاوەڵکاری مەرج وەک: بەومەرجە، ئەگەر، بەوشەرتە...
- ئاوەڵکاری شک و گومان وەک: شایەد، بەدەگمەن، بەگومانم، بەشکەم، رەنگە.
- ئاوەڵکاری ئامانج وەک: بۆ ئەوەی، لەبەر ئەوەی، تا...
- ئاوەڵکاری شوبهاندن وەک: وەکوو، هەروەک، وەک، هەروەکوو، بەوێنەی...
- ئاوەڵکاری سوێند وەک: بەخوا، بەخودا، واللە، بەسەری تۆ، بەگیان تۆ...
- ئاوەڵکاری ئارەزوو وەک: ئەی کاش، بریا، ئی‌شەاللە، پەنا بەخوا...
- ئاوەڵکاری دۆعا وەک: خواحافیز، خودات لەگەڵ، خوا بکا، بە دۆعا...
- ئاوەڵکاری نەتیجە وەک: نیهایەت، لە نیهایەت‌دا، دەستی ئاخر، خولاسە...

و....

## ٢ـ ئاوەڵکار لە روانگەی رواڵەتەوە

ـ ئاوەڵکاری سادە لەیەک وشە پێک هاتووە:

چاک، باش، خاس، کەم، زۆر، نزم، نزیک، کورت، حەتم، هەرگیز، هیچ.

ـ ئاوەڵکاری ناسادە زۆرتر لە یەک وشەیە:

چەن رۆژ لەمەو پێش، لەناکاو، لە ئێستاوە تا...، ساڵی پێشوو، مانگێکی تر، لەوکاتەوە تا ئێستا، بەو شەرتە تۆ بیت،...

## ٣ـ ئاوەڵکار لە روانگەی تایبەتی و هاوبەشی یەوە

ئاوەڵکاری تایبەتی، ئەو وشانەن وا هەمیشە ئاوەڵکارن و هەر مەعنای ئاوەڵکاریان لێ وەردەگیرێ.

وەک: هەمیشە، هەرگیز، حەتم، حەتمەن، بەفەوری، فەورەن...

ئاوەڵکاری هاوبەشی. وشەهایەکن لە نەوعی ناو، ئاوەڵناو، ئەمراز، جێناو، کردار، کە لەرستەدا دەوری ئاوەڵکاریش دەگرن.

وەک: شەو، رۆژ، باش، خراپ، ئەبێ، شایەد، بەڵکوو، خۆم، خۆی...

نموونە بۆ هەر دوو نەوعی تایبەتی و هاوبەشی.

ـ تایبەتی: ئەوان هەرگیز ئێمەیان نەدیوە. هەمیشە لەسەر ئەو باوەرەم...

ـ هاوبەشی: ئێمە شەو هاتین و رۆژ ئەڕۆین. شایەد ئەوان نەیەن.

* * *

## فەسڵی شەشەم: شێوەرستە (= شبە جملە)

شێوە رستە ئەو وشانەن کە لە ڕواڵەتدا یەک تا دوو وشـەی غـەیری کردارن بەڵام لە مەعنادا یەکێ لە هەست و حاڵەتەکانی دەروونی مرۆڤ رادەگەیەنن و مەعنای رستەوکرداریان لێ هەست دەکرێ و بەو هۆیەوە پێیان ئەوترێ «شێوە ڕستە».

وەک: «ئوخەی» واتە: لەو ڕووداوە زۆر خۆشحاڵم.

«ئافەرین» واتە: زۆر باشە.

«ئەفسووس» واتە: زۆر بە داخم.

شێوە رستەکان بەپێی مەعناوە زۆرن و گرینگترین‌یان ئەمانەن:

- **بۆ دەربڕینی هاندان:** ئافەرین، ماشاءَاللە، زۆر چاک، مـەرحـەبا، ئۆخەی.

- **بۆ دەربـڕینی داخ و پـەژارە:** داخـەکـەم، بـەداخـەوە، حـەیف، ئەفسووس.

- **بۆ دەربڕینی سەرسووڕمان:** عـەجـەب، بـێژی، نـەکـا، نـەیەژی، سوبحانە اللە.

- **بۆ دەربڕینی ئومێد و ئارەزوو:** ئامین، بەشکەم، بریا، کاش، پـەنا بەخوا.

- **بۆ پارێزکردن:** نەکەی، ئەهەی، ئامان، وس، وسکوت، مەرگ.

- **بۆ ئەمر و فەرمان:** دەی، هادەی، بسم‌الله، هێواش، بە عەجەلە، نەکەی.

- **بۆ دەربڕینی قەبووڵ و گوێڕایەڵی:** بانچاو، بەڵێ، بەڵێ قوربان، بەچاوان.

- **بۆ نەفی:** خێر، نەخێر، حاشا، خوا نەکا.

- **بۆ دەربڕینی بێزاری:** مەرگ، زەرەمار، تف، هیچ من و هیچ تۆ.

- **بۆ دەربڕینی خۆشی و شادمانی:** موژدە، چاومان ڕۆشن، ماڵی ئاوا، دەس خۆش.

و....

* * *

# فەسڵی حەوتەم: ئامراز (= حرف)

ئامرازەکان ئەو وشانەن کە سەربەخۆ مەعنایان نىیەو لەگەڵ وشەکانیتری زماندا بەکار دەبرێن و مەعنا پەیدا ئەکەن.

ئامرازەکان سێ نەوعن:

## ١ـئامرازی پاڵوێدان یا: خستنە سەر (= حرف اضافه)

ئەکەونە سەر ناو یا وشەیەکیتر و ئەو وشە پاڵ ئەدەن بە وشە یا وشەهایەکیتر لە رستەدا و دۆخی رێزمانی بۆ وشەکەی دوای خۆ دروست ئەکەن.

ئەم ئامرازانە لە روانگەی رواڵەتەوە دوو بەشن:

سادە: لە، بۆ، بە، تا، بێ، وەک، وەکوو، تەک، لای، بەر، نزیکی، شۆن، شۆنی، شوێنی،...

ناسادە: جودالە، بێجگەلە، بەغەیرەز، غەیرەز، لەبارەی، بەنیسبەتی، دەربارەی، لەحەقی، دەرحەقی، بەجێگەی، بەرەوڕووی، بەرامبەری، بۆلای، بوتەنشتی، لەتەک، لەگەڵ، لەبۆ،...

نموونە: من بۆ ئەوم باس کرد / بێجگەلە مامۆستا هەموویان هەن.

*

## ٢ـ ئامرازی پێوەند (= حرف ربط)

ئەکەونە بەینی، چەند وشە یا رستە و ئەو وشەو ڕستانە بەم شێوازانە پێکەوە ئەبەستن:

الف ـ لەبەینی دوو یا چەند وشەدا دێن و دۆخی بەرابەریان پێ ئەدەن: عەلی و پەرویز و دلێر هاتن. (عەلی، پەرویز، دلێر دۆخی کارایی‌یان هەیە).

ب ـ لە بەینی دوو یا چەند رستەدا دێن و رستە کان دە کەن بە هاودۆخ و بەرابەر: ئەوان هاتن و ئێمە ڕۆیشتین (دوو رستەی هاودۆخ پێکەوە بەسراون).

ج ـ رستەی ناتەواو پاڵ ئەدا بە رستەی بناغەیی‌یەوە:

هاتم تا پێت راگەیەنم («هاتم»: رستەی بناغەیی، «پێت راگەیەنم» رستەی ناتەواو).

د ـ دوو گروپ وشە دە کەن بە هاودۆخ و بەرابەر.

هاتنی ئەوان و ڕۆیشتنی ئێمە پێویستە. (دوو گروپی پێش و پاشی «و» هاودۆخ و بەرابەرن.)

**ئامرازی پێوەندی سادە و نادە:**

ـ سادە: و، وە، کە، وا، با، تا، یا، یان، ش، یش، بەڵکو، ئەگەر، بەڵام، وەلێ، نە، هەم،...

ـ نادە: چونکە، لەم رووەوە، بۆ ئەوەی، بۆ ئەوەی کە، ئێستاکە، ئەگەرچی، لەبەر ئەوەی‌کە، وەختێ کە، بەوشەرتەی، بەوشەرتەی‌کە، بەومەرجە، بەومەرجەی‌کە، بەهەرحاڵ، بێ‌ئەوەی‌کە، هەروەها کە، تا ئەو جێگاکە، هەرچەن کە...

**تێبینی:** ئامرازی «تا» ئەگەر بۆ راگەیاندنی کات و جێگا بێ، پاڵوێدانە.
وەک: لە ئێستاوە تا شەو / لە ماڵەوە تا زانستگە.
لە غەیری ئەو دوو حاڵەدا، ئەبێ بە ئامرازی پێوەند.
وەک: هاتم تا تۆ ببینم.

*

## ٣ـ ئامرازی نیشانە (= حرف نشانە)

دوو دەستەن:

### الف ـ نیشانەکانی بانگکردن (= نشانەهای ندا)

ـ «یا»، «ئەی» ئەکەونە پێش ناو.
وەک: یا رەببی / ئەی برای بەڕێز.
ـ «الف» ئەکەوێتە دوای ناو. وەک: خودایا.

### ب ـ نیشانەی خستنەپاڵ (= نشانۀ اضافە)

ئەم نیشانە «ی»ە کە بەدوای ناودا دێت و وشەی دوای خۆی ئەکا بە پالوێدراو (= مضاف‌الیه) یا ئاوەڵناو (= صفت) بۆ وشەی پێش خۆی.
وەک: ماڵی ئێوە، باخچەی ئەوین
ئاسمانی شین، پیاوی زانا.

**تێبینی:** ئەم نیشانە هەندێ جار، بەتایبەت لە زاراوەی سنەیی‌دا ناوترێ. وەک: پیاگ ئازا، ماڵ ئێوە.

* * *

# فەسڵی هەشتەم: پێشگر، پاشگر، ناوگر (= پیشوند، پسوند، میانوند)

پێشگر و پاشگر و ناوگر، وشەهایەکی ناسەر بەخۆن کە ئەکەونە هەوەڵ یا ئاخر یا ناوەندی وشەکانی زمانەوە و مەعنایەکی تازەتر بەو وشانە ئەبەخشن و دەوری وشەکانی زمان چالاکترو بەربڵاوتر ئەکەنەوە.

الف ـ پێشگرەکان چەند دەستەن:

## ۱ـ پێشگرەکانی کرداری بەردەوام و ئینشایی و نەهی و نەفی

۱ ـ ۱ پێشگری «ئە»، «دە»ی کرداری رابوردووی بەردەوام و ئێستای ئیخباری

دەهاتم، ئەهاتم، دەڕۆم، ئەڕۆم.

۱ ـ ۲ پێشگری «ب»ی کرداری رابوردووی بەردەوامی ئینشایی و ئێستای ئینشایی و ئەمر.

بمخوێندبایە، بڕۆیشتبایەم، بنووسین، بخوێنە.

۱ ـ ۳ پێشگری «مە»ی کرداری نەهی

مەڕۆ، مەخوێنە، مەڕۆن، مەنووسن.

۱ ـ ۴ پێشگری «نە»ی کرداری نەفی

نەمخوێند، نەهاتین، نەڕۆیشتم.

١ ـ ٥ پێشگری «نا»ی نەفی.

ناخوێنم، نایەم.

## ٢ـ پێشگرەكانی كرداری پێشگردار

٢ ـ ١ «دەر»

دەربڕین، دەرچوون، دەركەوتن.

٢ ـ ٢ «ڕا»

ڕاگەیاندن، ڕامالّین، ڕاهاتن.

٢ ـ ٣ «هەڵ»

هەڵگرتن، هەڵكەوتن، هەڵبەستن.

٢ ـ ٤ «تێ»

تێ گەیشتن، تێ كەوتن، تێ هێنان.

٢ ـ ٥ «لێ»

لێ هاتن، لێ دان، لێ خستن.

٢ ـ ٦ «پێ»

پێ گەیشتن، پێ هاتن، پێ چوون.

٢ ـ ٧ «تێك»

تێك دان، تێك چوون، تێك خستن.

٢ ـ ٨ «دا»

داسپاردن، داخستن، دابڕین.

۲ ـ ۹ «وەر»

وەرگرتن، وەرکەوتن، وەرهێنان.

۲ ـ ۱۰ «وێ»

وێچوون، وێخستن، وێهاتن.

## ۳ـ پێشگرەکانی ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار

۳ ـ ۱ «لا»

لامل، لاڕێ، لامەزەب.

۳ ـ ۲ «نا»

نائومێد، ناحەز، نابار، ناخۆش.

۳ ـ ۳ «نە»

نەساز، نەخۆش، نەزۆک.

۳ ـ ۴ «با»

باوەفا، باهونەر، باویژدان.

۳ ـ ۵ «بێ»

بێقسە، بێدەنگ، بێغیرەت.

۳ ـ ٦ «بە»

بەزات، بەهێز، بەخێر.

۳ ـ ۷ «هاو»

هاودەرد، هاوماڵ، هاوڕێ.

٣ ـ ٨ «له»

لەبار، لەپڕ.

٣ ـ ٩ «بۆ»

بۆچوون، بۆ هاتن، بۆبا

٣ ـ ١٠ «وه»

وه‌کردن، وەستاندن

*

## ب ـ پاشگر

پاشگر له زمانی کوردیدا زۆرەو لەوانه ئەنواعی ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار، چاوگ، ناوی چاوگ، دروست ئەبێ.

لێرەدا به زۆربەی ئەو پاشگرانه وا له زمانی کوردی ئەمڕۆدا چالاکن، ئاماژه دەکەین.

١ ـ «ا»: پانا، زانا، گەرما.

٢ ـ «ار»: وتار، دیدار.

٣ ـ «اک»: خۆراک، رووناک

٤ ـ «ان»: شەوان، بەیان، گولان

٥ ـ «انه»: پیاوانه، کوڕانه، رۆژانه، شێخانه، نەشمیلانه

٦ ـ «ـەر»: نووسەر، خوێنەر

٧ ـ «ـەنی»: وتەنی،

٨ ـ «ـەتی»: پیاوەتی، چۆنەتی

٩ ـ «ایەتی»: کەمایەتی، کەسایەتی

۱۰ـ «ایی»: قووڵایی، درێژایی
۱۱ـ «ە»: بەهارە، پایزە، ناڵە، سەوزە
۱۲ـ «ـەڵە»: گردەڵە، چەرمەڵە
۱۳ـ «ـەڵان»: ریخەڵان، کۆشکەڵان
۱۴ـ «ـەڵووکە»: بەفرەڵووکە، گێژەڵووکە
۱۵ـ «ـەڵێن»: دەسەڵێن، قامیشەڵێن
۱۶ـ «انی»: نوورانی، ڕۆحانی
۱۷ـ «ـەوە»: حەسانەوە، بووژانەوە
۱۸ـ «ـەوان»: بەرغەلەوان، تانجیەوان
۱۹ـ «ـەوانە»: گوێزەوانە، پووزەوانە
۲۰ـ «ـەوانی»: زۆرەوانی، بەرغەلەوانی
۲۱ـ «ـەمەنی»: خواردەمەنی، سووتەمەنی
۲۲ـ «بار»: رووبار، جۆبار
۲۳ـ «چی»: راوچی، چایچی
۲۴ـ «چە»: باخچە، دۆڵچە، مێخچە
۲۵ـ «ەک»: قووچەک، زۆڵەک
۲۶ـ «او»: فەوتاو، دووراو
۲۷ـ «اوی»: خۆڵاوی، قوراوی
۲۸ـ «یەتی»: ئازایەتی، چۆنیەتی
۲۹ـ «دەر»: خەوەردەر، گوێدەر
۳۰ـ «کەر»: راوکەر، ناوجێکەر، ئاسیاوکەر
۳۱ـ «گەر»: ئاسنگەر، وێنەگەر
۳۲ـ «گر»: وێنەگر، خۆگر.

٣٣- «گیر»: هەویرگیر، دەسگیر
٣٤- «راو»: کوژراو، نووسراو، بیسراو
٣٥- «یاگ»: شکیاگ، ڕفیاگ، بریاگ، بڕیاگ
٣٦- «ی» بەئەنواعیەوە: کوردستانی، ئێرانی، پیری
٣٧- «ین»: نەرمین، نەخشین
٣٨- «ینە»: رەنگینە، زێڕینە
٣٩- «نۆک»: گریینۆک، ترسنۆک
٤٠- «ـِـن»: چڵکن، ملقن
٤١- «ێ»: پیاوێ، خانووێ
٤٢- «ێک»: زەلامێک، بەردێک
٤٣- «ەکە»: نانەکە، ماڵەکە
٤٤- «کە»: چراکە، کایەکە
٤٥- «باشی»: حەکیمباشی، خەیاتباشی
٤٦- «تر»: چاکتر، خراپتر
٤٧- «ترین»: چاکترین، باشترین
٤٨- «یە»: نەزمیە، ئەمیریە
٤٩- «ێنە»: چەرمێنە، زەردێنە
٥٠- «کار»: خوێنکار، کرێکار
٥١- «ۆڵە»: مەشکۆڵە، خرتۆڵە
٥٢- «ۆ»: مامۆ، خالۆ
٥٣- «ۆک»: گِلۆک، لەرزۆک
٥٤- «ۆکە»: جنۆکە، گردۆکە
٥٥- «ۆڵ»: مژۆڵ، خرتۆڵ، کرمۆڵ

٥٦ـ «ۆڵکە»: تەپۆڵکە، کزۆڵکە

٥٧ـ «یلە»: خڕیلە، خشپیلە

٥٨ـ «یلانە»: خڕیلانە، خشپیلانە

٥٩ـ «وو»: ڕۆژوو، ژووروو

٦٠ـ «وولە»: مێشوولە، مێروولە

٦١ـ «وولکە»: داسوولکە

٦٢ـ «ێن»: چاڵین، تۆپێن

٦٣ـ «ێتی»: یەکێتی، چۆنێتی

٦٤ـ «سان»: کێوسان، دارسان

٦٥ـ «ستان»: کوردستان، تورکستان

٦٦ـ «جاڕ»: کەماجاڕ، گیاجاڕ

٦٧ـ «گا»: زانستگا، مەنزڵگا

٦٨ـ «گە»: روانگە، زانستگە

٦٩ـ «یار»: جووتیار، پرسیار

٧٠ـ «ـەوەر»: بەختەوەر، بیرەوەر

٧١ـ «ەک»: دەسەک، تیرەک

٧٢ـ «لەکە»: جوولەکە، توولەکە

٧٣ـ «ەوار»: هومێدەوار، خوێندەوار

٧٤ـ «وان»: گاوان، درگاوان

٧٥ـ «دان»: کڵدان، دەرزیدان

٧٦ـ «زار»: گوڵزار، وێنجەزار

٧٧ـ «مەن، مەند»: دەوڵەتمەند، ئابرومەند (مەن)

٧٨ـ «ناک»: خەمناک، نمناک

٧٩ـ «مان»: نیشتمان، سووتمان

٨٠ـ «ەوار»: شوێنەوار، بژارەوار

٨١ـ «ـِـک»: داسک، دەسک

٨٢ـ «یلکە»: کێویلکە، سێویلکە

٨٣ـ «(یە)کۆڵە»: شووتی‌یەکۆڵە، پاکۆڵە

٨٤ـ «ۆڵکە»: تەپۆڵکە

٨٥ـ «ۆڵِک»: تەپۆڵِک

٨٦ـ «ەڵ»: گردەڵ

## ج ـ ناوگر

**ناوگر، یەک یا دوو پیتەکە لە بەینی دوو وشەدا جێگر ئەبێ و مەعنایەکی تازە بەو وشە لێکدراوە ئەبەخشێ.**

ناوگرەکانی زمانی کوردی ئەمانەن:

١ـ «ا»: سەراسەر، سەراپا

٢ـ «او»: پشت او پشت، دوور او دوور

٣ـ «ـەو»: بەرەو خوار، سەرەو ژوور

٤ـ «ە»: سەرەخەر، گیزەگیز

٥ـ «و»: خوارو ژوور، دەس و برد

٦ـ «بە»: دەس بە دەس، پشت بە پشت

٧ـ «ان»: سەر ان سەر، بەران بەر

٨ـ «تا»: سەرتا پا، سەرتا سەر

* * *

# فەسڵی نۆهەم: ئەنواعی رستە لە زمانی کوردیدا

رستە لە ڕوانگەی نەوعی کردارەوە بەش ئەبێ بە:

١ـ رستەی ئیسنادی ٢ـ رستەی کرداری ٣ـ رستەی بێ کردار

١ـ رستەی ئیسنادی ـ بەرستەیەک ئەوترێ کە کردارەکە لە «بوون» پێکهاتبێ.

وەک: من دوێنێ نەخۆش بووم («بوو» کرداری ئیسنادییە)

ـ ئەو خۆشحالـە («ە» کرداری ئیسنادییە)

لەم رستانەدا، کارێک رووی نەداوە، بەڵکوو دۆخ یا ئاوەڵ ناوێ پاڵدراوە بە پالپشتێکەوە.

٢ـ رستەی کرداری ـ ئەوەیە کە کردارەکەی غەیری کرداری «بوون» و شێوازەکانی تری «بوون» بێ.

وەک: نەسرین هات («هات» کرداری تێنەپەڕی غەیری ئیسنادییە)

کەمال پێنووسێکی سەند. («سەند» کرداری تێپەڕی غەیری ئیسنادییە)

لەم رستانەدا، کارێک رووی داوە یا مومکینە لە بارودۆخی مەنفیدا، کار، رووی نەدابێ. وەک: ئەو پێنووسەکەی نەسەند.

٣ـ رستەی بێ کردار ـ ئەو شێوە رستانەن کە لەرواڵەتی رستەکەدا کرداریان تێدا نییە، بەڵام مەعنای کرداریان تێدایە.

وەک: دەستخۆش (= دەستت خۆش بێ) / بەداخەوە (= بەداخم)

لەم رستانەدا، کار رووی نەداوەو بەهۆیەوە پاڵ ئەدەن بەلای رستە

ئیسنادییەکانەوە.

## پایە سەرەکییەکان لە رستەکانی ئیسنادی و کرداریدا

١ـ رستەی ئیسنادی. ئەم رستە پێک دێت لە سێ پایەی سەرەکی پاڵپشت (= مسندٌالیه)، پاڵدراو (= مسند)، کرداری ئیسنادی

ـ ئەوان حازر نەبوون.

ئەوان: پاڵپشت، حازر: پاڵدراو، نەبوون: کرداری ئیسنادی

٢ـ رستەی کرداری. ئەم رستە بەهۆی کردارەکەیەوە، کە تێپەڕ بێ یا تێنەپەڕ، پایە سەرەکییەکانی ئەمانەن:

ـ بەکرداری تێپەڕەوە: کارا، بەرکار، کردار.

وەک: سیروان دەرسەکەی خوێند: سیروان: کارا / دەرس: بەرکار / خوێند: کرداری تێپەڕ.

ـ بەکرداری تێنەپەڕەوە: کارا، کردار.

وەک: ئەو هات / ئەو: کارا / هات: کرداری تێنەپەڕ

## ئەنواعی رستە لە روانگەی چۆنیەتی ئەنجامی کردارەوە

١ـ رستەی ئیخباری: هاتم، دەرۆین، دەخوێنن.

٢ـ رستەی ئینشایی: برۆم، شایەد هاتین.

٣ـ رستەی ئەمری: بڕۆ، بخوێنن.

## ئەنواعی رستە لە روانگەی تەواوی و ناتەواوی مەعناوە

١ـ رستەی سەربەخۆ و تەواو: هەواگەرمە، خوێندن بۆ هەموو پێویستە.

٢ـ رستەی ناتەواو: ئەگەر تۆ بخوێنی...، دوێنێ کە تۆ هاتی...

### رستە ناهەنجارەکان

ئەو رستانەن کە پایە سەرەکییەکانیان لەسەر جێگەی سوروشتی خوێاندانین و بەشێوازی وتاری لەجێگەی خۆیان ترازاون.

وەک: ۱ـ کاغەزت بۆ نووسیم / ۲ـ کاغەزم بۆ نووسیت / ۳ـ بۆم نووسیت

کە شێوازی ئەو رستانە بەپێی سوروشتی ئەبێ وابن:

۱ـ تو کاغەزت بۆ من نووسی.

۲ـ من کاغەزم بۆ تۆ نووسی.

۳ـ من بۆتم نووسی.

### رستە هاوپایەکان

ئەو رستانەن کە هەرکام بۆ خۆیان مەعنایەکی سەربەخۆیان هەیە و بەیاری ئامرازیکی پێوەند دراونتە پال یەک:

وەک: ـ من هاتم و ئەوان ڕۆیشتن

ئێمە هەموومان هاتین، بەڵام ئێوە هیچتان نەهاتن.

### رستە لێکدراوەکان

بەچەند رستەی پێوەندی ئەوترێ کە یەکێ لەو رستانە سەر بەخۆیە و رستەکانی‌تر بەو رستەوە پێوەندیان هەیە و ناسەربەخۆن.

رستەی سەر بەخۆ لەو زنجیرەدا، پایە یا رستەی سەرەکی‌یەو رستەکانی‌تر پاش‌کەوتووی مەعنایی‌یان پێ ئەوترێ واتە رستەی پەیڕەون. وەک:

ـ ئەگەر تۆ بیت، من دێم (ئەگەر تۆ بیت: پەیڕەو / من دێم: پایە)

ـ من هاتم تا پێت بڵێم، که ئەم کارەت باش بوو. (من هاتم: پایه / تا پێت بڵێم: پەیڕەوی (١) / که ئەمکارەت باش بوو: پەیڕەوی (٢))

## چەند سەرنج

١ـ ئامرازه پێوەندییەکان له ڕسته پەیڕەوەکاندا چالاکیيەکی بەرچاویان هەیه و ڕستەی پەیڕەو، بەو ئامرازانەوه دروست ئەبێ، ئەگەرچی له ڕواڵەتی ڕستەکەیشدا نەبینرێ.

وەک: «تۆ پێمان بڵێ چیت کردووه؟»

ئامرازی پێوەند ئەگەرچی له ڕواڵەتی ڕستەکه دانیيه بەڵام له مەعنای ڕسته پەیڕەوەکەدا هەیه: «... «که» چیت کردوه».

٢ـ ڕستەی پەیڕەو له زمانی کوردیدا ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| ١ـ ڕستەی تەوزێحی: | ئەوکوڕه واهات، کێ بوو؟ |
| ٢ـ ڕستەی تەوسیفی: | ئەو پیاوەکه باڵای بەرزه دۆستی منه. |
| ٣ـ ڕستەی دۆعایی: | مامۆستا (که) خوای لێ ڕازی بی، دڵسۆزمانه. |
| ٤ـ ڕستەی تەکمیلی نەتیجەیی: | پێنووسەکەم سەندکه بیدەم به تو |
| ٥ـ ڕستەی کاتی: | وەختێ که من دێم، ئەوان دەڕۆن. |
| ٦ـ ڕستەی شوێنی: | بۆ هەرکوێ که دەچی، بڕۆ. |
| ٧ـ ڕستەی غایی (ئامانجی): | دەرس بخوێنه با سەرکەوی. |
| ٨ـ ڕستەی سەبەبی: | بۆ ئەوەی که بەد خولق بوو، دەریان کرد. |
| ٩ـ ڕستەی موقایسەیی: | هەرواکەوتم، لێره نەماوه. |
| ١٠ـ ڕستەی شەرتی (مەرجی): | ئەگەر تۆ بیت، من دێم. |
| ١١ـ ڕستەی تەقابولی: | ئەگەرچی ناتوانم، دێم. |

* * *

## فەسڵی دەهەم: پایەکان لە ڕستەدا

**۱ـ کارا (= فاعل) ئەنجامدەری کردارە لە ڕستەدا بە کرداری ئیجابی یا سەلبییەوە.**

وەک: ئاوات نانی خوارد ئامانج ئەڕوا. /ئەوکوڕەنەهات. / ئەحمەد ناخوێنێ.

**۲ـ پاڵپشت (= مسندالیه) وشەیەکە وا دۆخ یا ئاوەڵ ناوێکی پێوە نیسبەت درابێ.**

وەک: ئەوکچە زیرەکە / هەوا ساردە.

**۳ـ جێگری کارا (= نایب فاعل) بەرکاری ڕستەیەکە واکردارەکەی ناپەیدایە و بەجێگەی کارا هاتوە.**

وەک: ئەوکتێبە سووتاوە. / نانەکە خوراوە.

**٤ـ بەرکار (= مفعول) وشەیەکە وا ئەنجامی کرداری تێپەڕی ڕستەکە لەسەر ئەو ئیسبات ئەکرێ. بەرکار هەمیشە لەگەڵ کرداری تێپەڕدا دێت.**

وەک: ئەوان جامەکەیان شکاند. / دەرسەکەی خوێند.

**٥ـ بەرکاری ئامرازی (= متّمم) وشەیەکە وا ئامرازی پاڵوێدان ئەکەوێتە سەری و واتای کردارەکە یا وشەیەکی تر لەو رستەدا تەواو ئەکا.**

وەک: ئەوان چوون بۆ زانستگە. / من لەگەڵ فەرهادا دەرسمان خوێند.

ئەو بۆ دیتنی ئێمە، لە تارانەوە، هاتوەتەوە بۆ سنە.

**٦ـ پاڵدراو (= مسند) ئاوەڵ ناو یا ناو یا وشەیەکی ترەکە وەکوو دۆخ نیسبەت ئەدرێ بە پاڵپشتەوە.**

وەک: کاوان قوتابییەکی ژیرە. / هەوا ئەمڕۆ ساردە.

**٧ـ پاڵوێدراو (= مضافٌ الیه و صفت) بە وشەی دوای نیشانەی خستنە پاڵی «ی» ئەوترێ. ئەو وشە یا ناوە یا ئاوەڵ ناوە.**

وەک: چەمی سیروان، کتێبی شێعر، دۆستی بەڕێز، گوڵی سوور

**سەرنج:** لە زاراوەی سنەیی (ئەردەڵانی)دا نیشانەی خستنە پاڵی «ی»، دوای وشەیەکی تەواو بوو بە پیتی بێدەنگ، بەکار ناهێنرێ، بەڵام ڕێکەوەندەکە بەرقەرارەو وشە دووەمەکە هەر ئەبێ بە دۆخی پاڵوێدراو.

چەم سیروان، کتێو شێعر، دۆس بەڕێز، گوڵ سوور.

ئەگەر پاڵوێدەر (= مضاف یا موصوف) بە پیتی دەنگدار، تەواو ببێ، نیشانەی خستنە پاڵی «ی» لە سنەیی‌دا، هەیە. وەک: چرای ماڵ، چرای ڕۆشن، پەنجەی درێژ، دەسەی گوڵ.

□ ئەنواعی پاڵوێدراو

**٧ ـ ١ تەوسیفی:** وشەی دووەم ئاوەڵ ناوە بۆ وشەی هەوەڵ: مرۆڤی زانا، ڕۆژی ڕۆشن.

**٧ ـ ٢ موڵکی:** وشەی دووەم خاوەنی وشەی هەوەڵە: پێنووسی ئەحمەد، باخی ئێوە. یا وشەی هەوەڵ خاوەنی وشەی دووەمە: خاوەنی ماڵ، ساحیبی باخ.

**٧ ـ ٣ تایبەتی:** وشەی هەوەڵ تایبەتی وشەی دووەمە: دیواری باخ، گیانی مرۆڤ

**٧ ـ ٤ قەرزی:** وشەی هەوەڵ ناوی بەشێ لە جەستە یا بەرگی مرۆڤ یا غەیری مرۆڤە و قەرزکراوە و دراوە بە وشەی دووەم: رووی رۆژگار، دەستی ئەجەل، داوێنی هیممەت.

**٧ ـ ٥ بەیانی:** وشەی دووەم جنسی وشەی هەوەڵ بەیان دەکا: پێڵاوی چەرم، کڵاوی بەن.

**٧ ـ ٦ تەوزیحی:** وشەی دووەم ناوی وشەی هەوەڵە: رۆژی شەممە، شاری مەریوان.

**٧ ـ ٧ فەرزەنی:** وشەی هەوەڵ ناوی کوڕ یا کچی وشەی دووەمە: عیسای مریەم، ئامێنەی رەشی.

**٧ ـ ٨ تەشبیهی:** وشەی هەوەڵ تەشبیە ئەکرێ بە وشەی دووەمەوە یا بەعەکەس: برۆی کەوان، چەمی فرمێسک.

**٨ـ بانگ کراو (= منادا) وشەیەکە هاوڕێ لەگەڵ یەکێ لە نیشانەکانی بانگ‌کردندا ئەو نیشانانە ئەمانەن:**

«یا»، «ئەی» پێش‌ناو دێن وەک: یا الله، ئەی برای من.

«ا» دوای ناو دێت وەک: پەروەردگارا

دۆخی بانگ‌کراو، شێوە ڕستە دروست ئەکا.

**٩ـ جێگر (= بدل) وشە یا وشەهایەکە، بەشوێن ناوێکی پێش خۆیاندا بێ‌دابڕان دێن و یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی ئەو ناوە رادەگەیەنن.**

وەک: سنە، ناوەندی پارێزگای کوردستان، شارێکی مێژوویی‌یە.

«ناوەندی پارێزگای کوردستان» دۆخی جێگری «سنە»ی هەیە و ئەو شارە باشتر دەناسێنێ.

**١٠ـ تەواوکەری واتای بەرکار (= متمّم مفعولی)**

**ناو یا ئاوەڵ ناوێکە لە ڕستەی کرداری تێپەڕدا دێت و واتای بەرکاری ئەو ڕستەیە تەواو ئەکا و بێ‌ئەو وشە نیسبەتی کردارە تێپەرەکە بۆلای بەرکارەکە، دروست نابێ و ڕستەکە ناتەواو ئەمێنێتەوە.**

وەک: بەو کێوە ئێژن چل‌چەمە. «چل چەمە» واتای کێوەکە تەواو ئەکاو بێ‌ئەو، ڕستەکە ناتەواوە.

نموونەی‌تر: ئەوکوڕەمان‌ناو ناوە «شێرزاد». زمانی مادەکانیان، کوردی زانیوە.

## ١١ـ ئاوەڵکار

ئاوەڵکار لە رستەدا دۆخی ئاوەڵکاری دەبینێ.

وەک: ئەوان شەو هاتن. ئێوە رۆژ بڕۆن.

## ١٢ـ کردار

کردارەکان لە رستەدا دەوری چالاکیان هەیە و وەکوو پایەی سەرەکی دەناسرێن و چونکە لە بەشی «کردار»دا باسمان لێ کردوە، لێرەدا دووپات نەکراونەتەوە (← کردار).

* * *

# بەشی چوارەم:

# نموونەهایەک لە پەخشانی زمانی کوردی ئەمڕۆ

□ زۆرترین ژمارەی دەستنووسە کوردییەکان کە لە گەنجینەکانی پترسبۆرگدا پارێزراون، ئەو دەستنووسانەن کە گرنگترین بەرهەمی ئەدەبی کلاسیکی کوردی لە خۆ دەگرن، تێبینی ئەوە دەکرێ کە بەرهەمی شیعریی گەورە شاعیرانی کورد لە پتر لە دەستنووسێکدا دووبارە بوونەتەوە، وەک: «مەم و زین» و «شێخی سەنعان» و «قەلاّی دمدم» و «حیکایەتی ئەسپە ڕەشەکە» و «لەیلا و مەجنوون» و «فەرهاد و شیرین» و «خەلیل بەگ و سیریجە خانم» و «یووسف و زولەیخا» و «زەنبیل‌فرۆش» و «گفتوگۆی فەقێ تەیران لەگەڵ ئاو» و زۆری دیکەش.

... کۆمەڵەی دووەمی دەستنووسە کوردییەکان کە دەقە فۆلکلۆرییە کوردییەکان لە خۆ دەگرن، ژمارەیەکی گەورەی گۆرانییە کوردییەکانی تێدایە لە زەنجیرەی ئافرەتان، کە بریتین لە گۆرانیی ئەوین و بەزم و خۆشی کە بە شێوەی کۆڕال لە ئاهەنگەکانی بووک گواستنەوەدا دەوترێن، هەروەها زەنجیرەی پیاوان کە گۆرانیی ئازایی و پاڵەوانێتی و گیانبازی و قوربانیدان لە خۆ دەگرێ.

ئەو گۆرانییە کوردییە ڕەسەنانە شیعر و ئاوازی جوانیان تێدایە و کانییەکانی لە بن نەهاتووی هونەری کوردین.

(جەودەت هوشیار: رامان ژمارە ٤٣)

□ بە بیرەوەری خۆم حەزم بە قسەی خۆش کردوە و لە بیستنی قسەیەکی خۆش وەکوو هەستم بە دەنگێکی نهێنی خۆش کردبێ وا بووم، لەبەر ئەوە خۆم لە خۆمەوە هەر ئەگەڕام بە شوێن ئەو قسەو سەرگوزەشتە کوردی یانەدا کە لەناو کورددا باو بوون، بە بێ ئەوە بە شتێکی‌تر بزانم گەلێکیان لە سنگما مانەوە، دیسان هەر تێریشم نەئەخوارد ئەمویست زیاتر ببێت، لە پاشا کە ئەمبینی گەلێکی‌تر وەکوو من هەر حەز بە قسەو سەرگوزەشتی خۆش ئەکەن و شوێنی ئەکەون، بەلامەوە سەیر بوو کە ئەمە بۆچ وایە؟ لە پاش وردکردنەوە تەماشام کرد ئەمانە ئەو مەعانیە ڕۆحی یانەن کە بە وشە تەعبیریان پێ لێ ئەدرێنەوە؛ ئەمانە ئەو ئەدەبەن کە لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد تێکلاو کراون.

(ڕشتەی مرواری، بەرگی یەکەم، علاءالدین سەجادی)

□ مارگرێت ڕوودینکۆ (١٩٣٠ - ١٩٧٦)ی خانمە ڕۆژهەلاتناسی پێشڕەو، لە ساڵی (١٩٥٤)دا، بڕوانامەی دکتۆرا (کاندیدات)ی لە یەکێ لە بەنرخترین لایەنی کەلەپووری کوردی وەرگرت، ئەویش چیرۆکی شیعریی «مەم و زین» بوو، بەرهەمی مەزنترین شاعیری کورد، شاعیر و فەیلەسووف و بیرمەندی نەمر (ئەحمەدی خانی)، کە بەرهەمە شیعرییەکانی بە لووتکەی پەرەسەندنی شیعری کوردی لە سەدەی حەڤدەیەم دادەنرێ و پێشڕەوی قوتابخانەیەکی دیاری ئەدەبییە، هەستێکی نەتەوەیی قووڵی هەبوو و لە خواستەنەتەوەییە ڕەواکانی میللەتی کورد دەدوا.

(جەودەت هوشیار: رامان ژمارە ٤٣)

☐ ... قسەکردن بە زمانی ژیانی ڕۆژانەیی شتێکەو بەکارهێنانی زمانی ئەدەبی بە هەموو وردبینی و نهێنی و جوانکارییەکانی شتێکیترە.

☐ چەند پەندێکی پێشینان:

١ـ باخەوان لە وەخت هەنگوراگوێچکەی ناژنەوێ.

٢ـ بەرد بووچکیش سەر ئەشکێنێ.

٣ـ ڕۆژێك بەکەڵەشێری، نەك هەزار ڕۆژ بە مریشکی.

٤ـ تۆم کرد بە جۆلاً، مەکۆم بدزیت؟

٥ـ کەمەڕم گورگ بیخوا، باگورگی نیشتمان بیخوا.

☐ «جاف» بە یەکێك لە هۆزە ناودار و گەورەکانی نەتەوەی کورد دادەنرێ. لە بنەڕەت و بنچینەدا هۆزی جاف لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجەوە لە خاکی ئێراندا کە پێی ئەووترێ «جوانرۆ» نیشتەجێ بوون، لەو شوێنەدا بە شێوەیەکی سەربەخۆ دەژیان...

دەرکەوتنی مێژووی هۆزی جاف لە شارەزووردا دەس پێ دەکات...

لە نەتەوەی کوردا جافەکان بەکوردی ڕەگەزو ڕەچەڵەك ساغ و پوخت و ڕەسەن دادەنران، چونکە بێ گومان گرنگترین و گەورەترین هۆزن لەکوردستانی خواروودا، بەڵکو بە زۆری وە یا بە تەنها بەم جافانەیان دەوت کورد وە بە ووشەی کورد لە هۆزەکانیترو ئەو دێهاتانەی کە سەر بە هۆز و تیرە نەبوون جیا دەکرانەوە، کاتێك بووترایە: کورد، یان کوردەکان بەواتەی جاف یا جافەکان دەهات. دێهاتنشینەکان دەیانووت: کۆچی کوردەکان هات، واتە کۆچی جافەکان هات. بەم شێوەیە وشەی کورد، یەکسانی وشەی جاف بوو، جافەکان زۆر شانازییان

بە ڕیشەو ڕەگەزی خۆیانەوە دەکرد، چونکە ئەمان لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمەوە هۆی دووبەرەکی و ناکۆکی بوون لە نێوان هەردوو ئەمبەراتۆریەتی عوسمانی و ئێراندا.

(کورتەیەک لە مێژووی هۆزی جاف، محمود عزیز حسن)

□ خوانـاسی بەناوبانگ مەولانا خالیدی نەقشبەندی، کوڕی ئەحمەدی کوڕی حسەینە، لە هۆزی ئاڵیبەگی مکایەڵی‌یە لە تیرەی جاف... هەروەها شاعیری هەڵکەوتوو نالی کوڕی ئەحمەدی شاوەیس لە هۆزی ئاڵی بەگی مکایەڵی لە تیرەی جافە.

شێخ رەزای تاڵەبانی فەرموویەتی:

خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا    مێرولە نەچێ چاکە بەگژ قوللەیی قافا

* * *

□ وادیـارە بەشی قوتابخانەچوونم بە سەرچوو بوو، بردیانمە حوجرەی مزگەوتی هەباساغاکە ببمە فەقێ، مامۆستاکەی منیان پێ سپارد، یەکێ بەرزە باڵای، موو ڕەش و چاو زەق و لووت بەرانی بوو. یەکێ تریش لای ئەوی دەخوێند: یەکی تۆپەڵەی، گردەبنەی، چاو زەردی، گوێ تەشکە بەرە بوو بە ناوی «فەقێ بایز». بەرلە هەموو کارێک فێریان کردم کە چۆن ئێوارانە بە ماڵانەوە بگەڕێم و هاوار کەم: «نانی فەقێ ڕەحمەتی خواتان لێ بێ!» نانی گەڕەک بچنمەوە و بیهێنمەوە حوجرە».

(چێشتی مجێور، هەژار)

زەمانی منداڵیم دام و دەستور لە گوندی موکوریان وابوو، ڕۆژی جەژن هەموو پیاوی کەیخودای ماڵ دەبوایە دوای خوتبەی جێژن و نوێژی جێژن، تێر دەم و فلچی یەکتر ماچ کەن و سلاوەتی بە شێعری کوردی لێ دەن، ئەمجار بە ریز دانیشن و لە ماڵە خۆیانەوە نانیان بۆ بێنن و دانیشن پێکەوە نانی جێژنە بخۆن، دەوڵەمەندو حال خۆشەکان پلاوی برنج و قەیسی، یان گۆشتاویان بۆ دەهات، هیوا هەبوو فەقیر بوو، پلاوی بڕۆیش، یان زۆر شیوی فەقیرانەیان هەبوو، ئەو هەموو جۆرە خواردنانە لە تەنیشت یەک دادەنران و هەموو پێکەوە لە نانی هەموانیان دەخوارد. مجێوری مزگەوت مەنجەڵێکی خۆی دێنا، هەرچی بەرماوی ئەو خەڵکە بوو بە سەریەکی دادەکرد و ئەمەش جێژنانەی ئەو بوو، کە ناوی نرابوو «چێشتی مجێور». (هەمان سەرچاوە.)

□ لەبیرمە جارێک شیعرێکم لە کۆبوونەوەیەکدا خوێندەوە، قازی محەممەد ئافەرینی کردم و گوتی سەد تمەنت بەخشش بێ، هەر لە مەجلیسەکە گوتم ئەو سەد تمەنە بدرێ بە دەفتەر و قەڵەم بۆ منداڵە فەقیرەکانی مەدرەسە. (هەمان)

□ جوامێر بە پەلە لە ماڵ هاتە دەرێ، خۆی کرد بە ماڵی مامە ڕەشەدا کە هەروا دیوارێکیان بەین بوو. نە پیاوە نەکچەکەی لە ماڵ نەبوون. بە تەنیا ژنی خاوەنماڵ لەوێ بوو، تکای لێ کرد کە بچێتە لای کاڵێ‌ی ژنی کە وا ژان ئەی‌گرێ تاکوو مامانی بۆ دێنێ چاوی لێوەی بێ، ژنە بە ڕوویەکی خۆشەوە دڵنیای کرد لە چوون و ئاگاداری‌ی کاڵێ کردنی.

ئەویش بە لۆقە کۆلانە تەنگە بەرەکەی خۆیانی بڕی. لە دڵیا پەژارە و

خۆشی پێکەوە قوڵپیان ئەدا... ئەویان بۆ ژان و ئازاری کاڵێ، ئەمیشیان بۆ ئەو مناڵەی کە ئەیان بێ. (ژانی گەل، ئیبراهیم ئەحمەد)

□ بەیانی دوای بەرچاییکردن لاوە بە جوامێری وت:

- ئەوە چی یە ئەڵێیت نیازت نی یە ئیمڕۆش بچیتە دەرەوە.

نە ءگیانە وانابێت هەستە بچۆ خۆت بگۆڕە. دەستێ جلی خۆمم بۆ داناویت رەنگە بە بەریشت زل بێت بەڵام هەر لەمەی ئێستەت چاترە، تا ئەچیتە لای بەرگدروو دەستێ جل ئەکەیت.

جوامێر نەختێ بە تووڕەیی وتی:

- جلم ناوێت جلەکانی خۆم باشە، خۆ ناچم بۆ شایی... ئەگەر چوومە دەرەوە هەر بەم جلانەوە ئەچم جلی تازەش ناکەم هەتا پارەم نەبێ... (هەمان سەرچاوە)

□ چێشتەنگاوێکی درەنگ بوو فڕۆکە بە ئاسمانا وەک واشە بۆ نێچیر ئەسووڕایەوە، کە هیچی بەدی نەئەکرد ئەو دارو دەوەن و کەژ و کێوەی ئەدایە بەر لێزمەی شەستیرو گرمەی بۆمبا! چەکدارەکانی لەشکر تاک و تەرا بڵاوەیان لێ کردبوو هەریەکە خۆی لە پەنا بەرد، چاڵ، بن بنچک و کوێرە شیوێکا مەڵاس کردبوو. (هەمان)

□ کورتە نموونەیەک لە زمانی کوردی کرمانجی باکوور، بۆ بەرابەرکردنی لە تەک کوردی کرمانجی باشووردا.

گەلەک بەیت و داستانێد کوردی یێدهێژاوب نرخ هەنە. ژوان بەیت و داستانان داستانا «مەم و زینێ» داستانا هەرە هەواسکارە، دلرەڤینە و دلخوەشە. لە هەموو گۆشێد کوردستانێ. لە هەموو جی و وارێد کوردتێدا

دژین، ناف و دەنگێ وێ داستانێ تێ بهیستن، چیرۆکبێژ و دەنگبێژ وێ ب دل و جـان ب زار گـلی دکـن، دسترێن، یـان ژی ب کـێفخوەشی و خوەشحالی ب تڤیسارا ئەحمەدێ خانی دخونن و دلێ خەلقێ پێ هەیجان دکن.

(گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب ۶، پڕۆفیسۆر قەناتی کوردۆ)

* * *

# فەرهەنگۆک (کوردی ـ فارسی)

أ

| | |
|---|---|
| ئاکامی چاوگ | حاصل مصدر |
| ئامانج | هدف |
| ئامراز | حرف |
| ئاوەڵکار | قید |
| ئاوەڵناو | صفت |
| ئەندازە | اندازه |
| ئیخباری | اخباری |
| ئێستا | حال |
| ئیسنادی | اسنادی |
| ئیشارە | اشاره |
| ئینشایی | انشایی |

ب

| | |
|---|---|
| بانگکراو | منادا |
| بانگکردن | ندا |
| بڕگە | هجا، سیلاب |
| بن زاراوە | لهجه |
| بەرز | بلند |
| بەردەوام | استمراری |
| بەرکار | مفعول |
| بەرکاری | مفعولی |
| بەرکاری ئامرازی | متمّم |
| بێدەنگ | صامت |

پ

| | |
|---|---|
| پاشگر | سیوند |
| پاڵپشت | مضاف، مسندٌالیه |
| پاڵدراو | مسند |
| پاڵشت | مضافالیه |
| پاڵوێدان | اضافه |
| پاڵوێدراو | مضافالیه، صفت پس از موصوف |
| پاڵوێدەر | مضاف |
| پایە | رکن |
| پرسیار | پرسشی، پرسش |

| | |
|---|---|
| پەیدا | معلوم |
| پێوەند | پیوند، ربط |
| پێشگر | پیشوند |
| پێشگردار | پیشوندی |
| پیت | حرف |

## ت

| | |
|---|---|
| تاک | مفرد |
| تایبەت | خاص |
| تایبەتمەندی | ویژگی |
| تایبەتی | تخصیصی |
| تەواو | کامل |
| تێپەڕ | متعدّی |
| تێنەپەڕ | لازم |

## ج

| | |
|---|---|
| جودا | جدا، منفصل |
| جێگر | بدل |
| جێگری کارا | نایب فاعل |
| جێناو | ضمیر |
| جێگە | مکان |

## چ

| | |
|---|---|
| چاوگ | مصدر |
| چۆنیەتی | چگونگی(قیدچگونگی) |

## خ

| | |
|---|---|
| خستنە پاڵ | اضافه(نشانۀاضافه) |
| خستنە سەر | حرف اضافه |
| خۆیی | مشترک (ضمیر) |

## د

| | |
|---|---|
| داهاتوو | آینده، مستقبل |
| دۆخ | حالت، نقش |
| دووپات | تکرار |
| دوور | دور |
| دەنگ | آوا |
| دەنگ دار | مصوّت |

## ر

| | |
|---|---|
| رابوردوو | ماضی، گذشته |
| رانە بوردوو | حال، آینده |
| راهێنان | تمرین |
| رستە | جمله |
| روتبی | ترتیبی |

| | |
|---|---|
| رەگی کردار | ریشهٔ فعل |
| رێزمان | دستور |
| رێنووس | خط |

## ز

| | |
|---|---|
| زاراوە | گونه |
| زمان | زبان |
| زەمان | زمان |

## ژ

| | |
|---|---|
| ژمارە | شمارش،عدد،شمارشی |

## س

| | |
|---|---|
| سات | ساعت |
| سادە | ساده، بسیط |
| سەربەخۆ | مستقل، ذات |
| سەرتر | تفضیلی |
| سەرترین | عالی |
| سەرسووڕینەر | تعجّبی |

## ش

| | |
|---|---|
| شوێن | مکان |
| شێوە ڕستە | شبه جمله |

## ف

| | |
|---|---|
| فەرزەنی | بُنُوّت |
| فەرمان | امر |

## ق

| | |
|---|---|
| قەرزی | استعاری |

## ک

| | |
|---|---|
| کات | زمان |
| کارا | فاعل |
| کارایی | فاعلی |
| کردار | فعل |
| کۆ | جمع |
| کەس | شخص |

## گ

| | |
|---|---|
| گچکە | مصغّر |
| گشتی | عام |
| گیرەدار | مشدّد |

## ل

| | |
|---|---|
| لقی سەرەکی | شاخهٔ اصلی |
| لکاو | متّصل، پیوسته |

| | |
|---|---|
| لەقەب | شاخص |
| لیاقەت | لیاقت |
| لێکدراو | مرکّب |

م

| | |
|---|---|
| مەرج | شرط |
| مەرجی | شرطی |

ن

| | |
|---|---|
| نادیار | مبهم |
| ناپەیدا | مجهول |
| ناو | اسم |
| ناوجێ | میانجی |
| ناوگر | میانوند |
| ناوی دەنگ | اسم صوت |
| ناوی سەربەخۆ | اسم ذات |
| ناوی نادە | اسم غیربسیط |
| ناوی ناسراو | اسم معرفه |
| ناوی ناسەربەخۆ | اسم معنی |
| ناوی نە ناسراو | اسم نکره |
| ناوی هاوکێش | اِتباع |
| نزم | کوتاه (مصوّت) |
| نزیک | نزدیک |
| نەفی | نفی |
| نەهی | نهی |
| نیسبەت | نسبت |

و

| | |
|---|---|
| وشە | کلمه، واژه |

هـ

| | |
|---|---|
| هاوبەشی | مشارکت، متقابل |
| هاوکێش | هم وزن |
| هەیی | ملکی، تعلّقی |

سەرچاوەکان:

□ کوردی (سەرچاوەکانی ڕێزمانی و زمانەوانی)

١ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی ـ جێناو ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری، بەغدا، ١٩٨٧.

٢ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کۆی ناو لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب ٦، بەغدا، ١٩٧٨.

٣ـ جەمال ڕەشید ئەحمەد، لێ کۆڵینەوەیەکی زمانەوانی، وەزارەتی ڕۆشنبیری، بەغدا، ١٩٨٨.

۴ـ جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، ئەلمانیا، ١٩٧٦.

□ فارسی (منابع دستوری و زبان‌شناسی و آواشناسی)

۵ـ انوری، حسن و احمدی، حسن، دستور زبان فارسی ٢، انتشارات فاطمی، تهران، چاپ ٢١، ١٣٨٠.

٦ـ ثمره، یدالله، آواشناسی زبان فارسی، مرکز نشر دانشگاهی، تهران، چاپ سوم، ١٣٧١.

٧ـ حق شناس، علی محمد، آواشناسی(فونتیک)، انتشارات آگه، تهران، چاپ ششم، ١٣٧٨.

٨ـ رُخزادی، علی، آواشناسی و دستور زبان کُردی، انتشارات ترفند، تهران، چاپ اوّل، ١٣٧٩.

٩ـ رُخزادی، علی، بررسی آوائی و دستوری زبان کُردی، دانشگاه شهید چمران، اهواز، ١٣٧١.
١٠ـ سامارین، ویلیام، زبان‌شناسی، راهنمای بررسی گویشها، ترجمهٔ لطیف عطّاری، مرکز نشر دانشگاهی، تهران، بی‌تا.

### □ کوردی (سەرچاوەکانی مێژوویی و ئەدەبی)

١١ـ ئیبراهیم ئەحمەد، ژانی گەل، سلێمانی، ١٩٧٢.
١٢ـ جەودەت هوشیار، گۆڤاری ڕامان، ژمارە: ٤٣.
١٣ـ علاءالدین سەجادی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب ٦، بەغدا، ١٩٧٨.
١٤ـ علاءالدین سەجادی، ڕشتەی مرواری، بەرگی یەکەم، بێ‌جێ، ١٩٥٧.
١٥ـ قەناتی کوردۆ، گۆڤاریٰ کۆڕی زانیاری کورد، ب ٦، بەغدا، ١٩٧٨.
١٦ـ محمود عزیز حسین، کورتەیەک لە مێژووی هۆزی جاف، چاپخانەی نەورەس، سلێمانی، ١٩٨٥.
١٧ـ هەژار (عبدالرّحمان شەرفکەندی)، چێشتی مجێور، پاریس، چاپی یەکەم، ١٩٩٧.

